ناوی کتێب: قەلەڕەش و زەنگەکان

ناوی نووسەر: کۆمەڵێک نووسەری بیانی

ناوی وەرگێڕ: شێرزاد حەسەن

بابەت: شیعر

هەڵەچن: نیشتمان محەمەد فاضل

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: سەیران عەبدولڕەحمان

تیراژ: ٤٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: ٥١١ ی ٢٠٠٢

زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (٢٠٢)

www.sardam.net

## وتەیەك:

"هەڵبژاردنی ئەم شیعرانە پەیوەندی بە هیچەوە نییە جگە لەو تامو چێژەی کە لێم چەشتوون.. پاش و پێش کردنی شیعرەکانیش بە پایەو پلەی شاعیرەکانەوە پەیوەست نییە.. تەنها ڕێکەوتەو هیچی تر."

-وەرگێڕ-

ئینگلتەرە

## هێشتا باران دەبارێ

"ئێدث ستوێل"

ئەمێستاش باران دەبارێ..
تاریک چون جیهانی ئینسان..
ڕەش وەک -ونبوون-ی هەمووومان
کوێر هەروەک هەزار و نۆ سەدو چل بزماری..
داکوتراوی سەر "خاچ"ەکەمان..!

*

ئەمێستاش باران دەبارێ
لێزمەی.. هەر لە ترپەی دڵ دەچێ..
ترپە ترپێک..
لەگەڵ زرمەی چەکوشی -گۆڕەپانی گۆزەکەر- بگۆڕێ..!
خرمەو لێزمەی..

لە تەپەو زرمەی پێ پیسەکان دەچێ

کە بەسەر مەزاری پیرۆزی -ئەو-دا..

ڕابورێ:

ئەمێستاش باران..

بەسەر کێڵگەی خوێندا.. دەبارێ

بەسەر ئەو کێڵگەی کەم ئومێدی تیا دەڕوێ

هۆشی مرۆڤیش: دەبێتە خۆراکی چاوبرسیەتی

خۆراکی کرمەکەی تەوێڵی (قابیل)

ئەمێستاش باران دەبارێ..

دەبارێتە بەرپێی ئەو مرۆڤە برسی‌یەی

بەو خاچەوە داکوتراوە

ئەو مەسیحەی هەموو ڕۆژێک.. هەموو شەوێک

بۆ -بەخشندەیی- ئێمە لە خاچ دەدرێ

بۆ بەخشندەیی هەژار و دەوڵەمەندان

خۆ لەبەر بارانیشدا..

زێڕو برین -چوون یەک- وان..!

*

ئەمێستاش باران دەبارێو

لە کەلەکەی مرۆڤێکی برسیو بریندار..

خوێن دادەچۆڕێ

ئەو مرۆڤەی لە دڵیا برینەکانمان هەڵدەگرێ

برینی ئەو -نوور–ەی کە مرد

دوا تروسکەی کز..

لە دڵێکی خۆکوژ.. برینی تاریکییەکی غەمهێن..

تاریکییەکی بێ بەخشش

برینەکانی ورچێکی زۆر بە ئازار

ورچێکی کوێر و دەم بە هاوار..

خاوەنەکانی بکەونە گیانی

لە هەموو لایەکەوەش دارکاری بکەن..

جەستەی بەستراوی هەلاهەلا کەن

یا فرمێسکەکانی..

چەن کەروێشکێکی ڕاوکراو بن..!

*

ئەمێستاش باران دەبارێ

دواییش "-ئۆه.. من ڕووەو بارەگای خوا..
هەڵدەفڕم:
ئەو بەرەو خوار ڕامدەکێشێ-"
ئەها بڕوانە.. بڕوانە
خوێنی مەسیح جۆگەی بەستووە لەو ئاسمانە
ئا لەو تەوێڵەوە دەڕژێ
کە بەو درەختەوە داماں کوتا
قووڵ تا مەرگ.. تا دڵی تینوو
ئەو دڵەی گڕی دونیای لەخۆ بەرداوە
هەروەک تاجە گوڵینەکەی قەیسەر..
بە گڕی ئازار ڕەش داگەڕاوە..

*

پاشان سەدای دەنگێ دێ..
هەروەک لە دڵی مرۆڤەوە بێ
مرۆیەک کە ڕۆژێ مناڵ بووبێ
لەنێو دڕندەکانا ژیابێ-
هەر ئەو دەنگەش بێو بڵێ:

"ئەمێستاش خۆشم دەوێن..

ئەمێستاش -نوور-ی پاکم..

خوێنی خۆمتان بۆ دەڕێژم."

***

## پەراوێز:

(١)هێشتا باران دەبارێ: بۆنەی تایبەتی ئەم شیعره -شەڕەکەی بریتانیا- بوو، لە ساڵی (١٩٤٠)دا فڕۆکەکانی -نازیەکان- بەشێکی زۆری شاری -لەندەن- یان بۆردومان کردو بە درێژایی شەوو بگرە بۆ بەیانییەکەشی ئاگرو ئاسنی تواوەی دادەبارانده سەر شاری لەندەن، بە هەزارەها کەس کوژران و بریندار بوون، ئەم شیعرەش لە ڕوانگەیەکی مرۆڤانەو هەم ئایینییەوە سەیری مێژووی خوێناوی مرۆڤ دەکا.. کە هەموو ڕۆژێك لەبەرچاوی پاك و پڕ ئازاری عیسای لە خاچ دراودا یەکتری دادەپاچن. ئاوو هەوای شیعرەکەش مەسیحیانەیەو ئەوەشیان بۆ سۆزی دینی شاعیرەکە خۆی دەگەڕێتەوە، توانیویەتی مەسیح بکا بەو ڕەمزەی کە هەمیشە دڵڕەقی مرۆڤ پیشان دەدا.. هەر لەو ڕۆژەوەی"قابیل" "هابیل"ی برای کوشت: مرۆڤ لە خوێن ڕشتن نەوەستاوە، هەڵبەتە زۆربەی ئەو خوێنەش بۆ سەرخستنەوەی هەق نەبووە.. هەندێك لەو بڕوایەدان کە شەڕ مەسەلەیەکی پێویستەو ویستنی شەڕو دوژمنکاری غەریزەیەو لە مرۆڤدا جێگیرە.. تۆ بڵێی ئەم قسەیە ڕاست بێ..؟ گەر ڕاست بێ هیتلەرو

مۆسۆلینی گوناهیان نی‌یە.. هەڵبەتە ئەم بۆچوونە چەواشـەکردنی مرۆڤـەو هەر کەسێکیش وا بڵێ دیارە کە لە -مێژوو- نەگەیشتووە.

(٢)هـەژارو دەوڵەمـەندەکان: لـە شـیعرەکەدا -دەیڤـس- و -لازارۆس-ە. یەکەمیان نموونەی دەوڵەمەندەکانـەو دووەمیشـیان هـی هـەژاران، ئـەوانیش ئەو دووانەن کە "عیسا" وەك -موعجیزە-یەك زیندووی کردنەوە.

(٣ )ئەم دوو دێڕەی برگەی چوارەمیش قسەی "سەنیت لۆقا"یەو بە "لازارۆس" دەڵـێ - "ئـۆه.. مـن ڕووەو بارەگـای خـوا هـەڵدەفڕم.. کـەچی ئـەو بـەرەو خـوار ڕامدەکێشێ.. بڕوانە.. بڕوانە خوێنی مەسیح وا لە ئاسمان جۆگەلەی بەستووە..!"

هـەر ئـەم چـەند دێـڕە دوا مۆنۆلۆگـی -دکتـۆر فاوسـتـ-ە کـە لـە شانۆگەری‌یەکەی _مارلۆ-دا بەرچاو دەکـەوێ، ئـەم چـەند دێـڕەش دەربڕینـی پـڕ لـە تـرس و ڕاڕایـی -فاوسـتـ-ە کاتـێ هـەوڵی ئـەوە دەدا لـەو لەعنەتـە ئەبەدی‌یە ڕزگاری بێ.. بۆیە پەنا دەباتە بەر خواو هاواری بـۆ دەکا چونکە فاوست ڕۆحی خۆی بـە شـەیتان فرۆشـتووەو بـەر نـەفرەتی خـوا کـەوتووە.. "سـتوێل"ی شـاعیریش بۆردومانەکـەی هیتلەری‌یـەکان بـەو نەفرەتـە دەشوبهێنێ، ئەو نەفرەتەش بارانی خوێن ئاسا بەسەر ئەو خەڵکـەدا دەبارێ تا پتر نغرۆو سەرنگوم بـن.. لـە گونـاهی ئـەو ڕۆژە ڕەشـەی کـە عیسـایان لـە خـاچ دا.. کـەچی هـەر عیسـایەو لـە کۆتـایی شـیعرەکەدا لـە هـەموویان دەبوورێو لە پێناوی ئەو خەڵکەدا ئامادەیە خوێنی خۆی بڕێژێ.

لە کۆتایی‌دا با ئاگامان لەوە بێ کە -ستوێل- ئافرەتـەو شـاعیرێکی هـەرە بـەناوبانگی بریتانیـا بـوو.. لـە سـاڵی (١٨٨٧)دا لـە دایـك بـووەو لـە (١٩٦٤)دا کۆچی دوایی کردووە.

**ئینلگتەرە**

## "تەنیا باڵی"

**ئیلزابێث جیننگز**

ئەمێستا دوور لە یەکدی..
هەریەکەو لە پێخەفێکی تەنیا
کابرا خۆی و کتێبێک..
درەنگەو.. کەچی چرا خامۆش ناکا
ژنەش چون کچێکی عازەب ئاسا..
خەون بە ناڵییەوە دەبینێ
هەموو پیاوانیش وان لە دونیایەکی تر
هەروەک بڵێی چاوەڕێ بن
چاوەڕێی چەند ڕووداوێکی تر
کتێبەکەش دەق نەشکاوە
ژنەش چاو لە مۆلەق

لە تارماییەکانی بنمیچ ڕادەمێنێ
هەردوو..
تەختەو پارچەی بەلەمێکی شکاون و..
سەرئاو کەوتوون
لە سۆزێکی دێرین.. هەردوو جێماون
چەند ساردوسڕ.. چەند مردووانە ڕاکشاون
هەروەک بڵێی زۆر بە کەمی..
زۆر بە دەگمەن تێک ئالاَبن
خۆ گەر دەستیشیان بەر دەستی یەکدی کەوێ
دەلیلی سۆزێکی کەم.. یا زۆر دەنوێنێ
چ چارەنووسێکە کە "تەهارەت" لە باوەشێ کردوون
ئەو چارەنووسەی بە هەموو ژیان
خۆی بۆ لە بۆسە نابوون
چەند غەریبانە تر نزیک یەکدی
خامۆشیش لەو نێوانە تاڵە دەزووێکە بگیرێ
کەچی تێیان نائاڵێ.. تێی نائاڵێن
زەمەنیش شاپەڕێکە.. نەرم.. لەسەرخۆ

خۆی لە جەستەی هەردووکیان هەڵدەسووێ

تۆ بڵێی بزانن کە هەردوو پیر بوون

دایەو باوە

تۆ بڵێی بزانن..

ئەو گڕەی ئەوان کە منی لێ خوڵقاوە

ئەمێستا ساردوسڕ.. دامرکاوە..؟

**لە کتێبی:**

20 th Century Women Poetry Edited by Fleur Adcock لەندەن/ ١٩٨٧

## ئینگلتەرە

### "تەنیایی"

هارۆڵد مۆنرۆ

که تۆ هەموو شتەکانت بۆ شەو هەڵدەگری
بیرەوەرییەکانت.. دەستی خەو دێو..
دەیان سڕێتەوە
بە ڕووی ئاگردانی درەنگی شەو مات دادەمێنیت
زۆر غەمگینتر لەوەی بتوانی بۆ خۆت بگریت..!

***

کەڵکەڵەی شتەکانی ئەو ژوورە ساکارە
بە درێژایی ڕۆژ هاودەمی خامۆشیتە
تەنها ئەو درەختەیە سۆز بنوێنێ
قەتیش ژووری پڕ جنۆکەت نایدرکێنێ:
"دەبێ کەسێ لەتۆ دوور بێ..!"

***

ئەو سەگە چکۆلانەش.. وەنەوز دەداو بەلادا دادێ
باوێشکێک و لموزیت بۆ بەرز دەکاتەوە
هێدی هێدی کلکە لەقەیەتی
تا هەست بکەی.. خۆت ئاسایی تەنگەدڵی
***
لە دوورەوەش گرەی ماکینە.. یا چرک و هوڕی
بانەکەتە.. یا شەوبای شێتەو دەرگاکە دەباو دەهێنێ.
***
ئەو خامۆشی‌یە.. شووشەی شکاوەو ڕژاوە
چرکەکانیش گوێ بۆ یەکتری مووچ دەکەن
دیسان بە یەکا دێنەوە..
چەند بە توندی دێن و بە گرانی بەسەرتا تێئەپەڕن
***
تۆش سەر لار دەکەیتەوەو دوو دڵۆپ فرمێسک..
دەسڕیتەوە
تەنیاییش هەنگاوێکی گرانتر دەنێ و..
باوەشیت بۆ دەگرێتەوە..!

## ئینگلتەرە

## "دوا نامەی -جۆنی- بچکۆل"

دایە..

ئیمڕۆ ئێوارە ناگەڕێمەوە ماڵێ

جا خۆت سەغڵەت مەکە.. نەکەی بە پەلە ڕایگەیەنی

خۆت مەکە بەنێو زێراب و جۆگەلەکان دا

وام بڕیاردا لەسەر پێی خۆم بوەستم

نەکەی بەنێو دارستانەکان دا بگەڕێی..

خۆم نەشاردۆتەوە

هەر ئەوەیە کە بە دوای هاوکووفی خۆمدا دەگەڕێم

شرۆ شیتاڵم لە دەرەوە جێ نەهێڵی

ئاگام لە خۆیەو.. دەزانم چیم کرد

ڕەسمەکەم هەڵنەگری و بەنێو خەڵکیدا بیگێڕی

من وام لە بەرگی پیاودا
پەسەندە لام.. با هەموو بزر بێ لە تاریکیدا
وام بۆ لواوە..
پانتۆڵە کورتەکەم داکەندو..
ئەمێستا درێژترم لەبەر کردووە
وا ڕووەو شارێکی تر هەنگاو دەنێم
جا خۆت شێت مەکەو..
با کەسیشمان تێنەگا
ئێستا کرێ گرتەی ژوورێکی بێ پەردەم
سەرمابردوو..
لە پشت پەنجەرەیەکەوە دانیشتووم
ئەم بەیانییە.. لە ڕادیۆکەوە گوێم لە ناڵەت بوو..
غەریبانە..
چەن غەمگین و پیر هاتیتە بەرچاوم..
دایە...!!

## "گۆرانی‌یەك بۆ هاوسەرەکەی پارم"

بریان پاتن

ئالیس[1].. ئەوەیان یەکەم زستانەو..
وە ئاگا دێم و تۆ بزریت..
دەشزانم کە تۆ جلەکانی ئەوسات لەبەردایە
دەشێ لە شوێنێکی تر بیت.. خۆ دەشێ
بێئاگا بیت لە یادی بەسەرچووی خۆمان
بینیوتە..؟ خاک هەر ئەو خاکەی جارانە،
باخچە چۆڵەکانیش هەر ماون..؟
لەوە دەچێ هیچ شتێک نەگۆڕابێ
وەئاگا دێم و دەمێکی تر..
لەنێو دەممەو لە بەشم دەخوا
وەلێ وا هەست دەکەم..

ئەستەمە ئەڤین ڕۆحی من جێ بهێڵێ
بوو بە ساڵێک.. جا چییە..؟ تۆ دەیڵێی
وەلێ من سیخوڕەکانی خۆم ناردن
تا بزانم ئەمێستا لەگەڵ کێی..
ئاخۆ ئێستا خولیای چیت..؟
کە دێنەوە بە زەردەخەنەوە پێم دەڵێن:
هەروەک جارانی خڕوخۆڵە،
بەردەوامەو هەروا دەژی.. بەتین و تاو.. بە داوایە
وەک ئەو ڕۆژەی بۆ یەکەمجار تۆی ناسی..
دەشێ ئەوە زستان بێ..
لەبەر غوربەت و تەنهایی و دابڕانی لە وەرزەکان..
کە وەئاگا دێم..
بۆ گەواهی تارمایی تۆم بۆ دەنێرێ
ئەمڕۆ یەکێک هات و لێمی پرسی:
ئا لێرەدا چۆنت گوزەراند.. چۆنت ڕابوارد..؟
خەیاڵی تۆم کرد.. تۆیت و لە شارێکی تر وەئاگا هاتی..
هەر لەم ساتەی تیا دەژیم.. تۆش پەست بوویت

ئاسایی.. شتێک وەک -ون بوونت- ئێستا

هات و منی گەمارۆدا..

(١)ئالیس: ناوی ژنەکەیە

## شیعرێکی خۆشەویستی

بریان پاتن

-تۆ ئەو گیانەی شەوەهای شەو

کە هەر بۆ من دەکرێیتەوە

بۆ تەنهایی تۆ پەنامی.. باوەشم بۆ دەگریتەوە

ئەو گومانە زۆرەی کە من لیٚی بووم

تۆ دێیت و بۆم دەسڕپیتەوە

شەو بە دوای شەو..

بەخۆتەوە تامم دەکەی.. بۆم دێیتەوە

*

شەوێک دێ و شەوێک دەڕوات
لەنێو جوڵەو ڕەوت و لەنجەت
خەیاڵی جێنووستنم بیرچۆتەوە
لەژێریا وا نوقمم..
بە دوای تارمایی و تەمیشدا
بۆ تامی تۆ ڕادەکەم و ئاوا ونم..
وەسفی جوانیت بە من ناکرێ
شەوێ دێ و شەوێ دەڕوات
دوای شەوێک تۆ لە تەکمای
هەر شەوێکیش تۆی تیا نەبیت..
چڵکنەو تاریکەو نەهات..

*

تا ئێستەش هەر نەمزانیوە
چ کیمیایەکی کۆنینە وای کردووە
کە نە گۆشت و نە ڕەچڵەکت..
لە خەڵکی ئەم دونیایە نەچووە
نە دەشزانم بۆ هەر شتێک لای هەر کەسێک ئاسایی‌یە

لە تۆدا دەبێ بە تاک و هاوتای نی‌یە
کەچی تەنها وەلاَمێک..
دڵۆپە ئاسا بە بڕبڕەی پشتما دەڕوات
لە خۆی دەدوێ و.. خۆیشی تێک نادات..

* * *

**بریان پاتن**: شاعیرێکی گەنجی ئینگلیزی‌یەو لە ساڵی (١٩٤٦)دا لە شاری -لیڤەرپول- لە دایك بووە. لە تەمەنی پانزە ساڵیدا قوتابخانەی بەجێ هێشتووەو لەگەڵ چەند شاعیرێکی هاوتەمەنی خۆی‌دا لە گۆڤاری (ئەندەردۆگ)دا دەستیان بە بلاَوکردنەوە کردووە. ئەگەرچی لە هەمووشیان بچوکتر بووە بەلاَم بووە بە هۆی بزوتنەوەیەکی ئەدەبی بە ناوی (شاعیرانی لیڤەرپول).

خەریکی ئەدەبی منالاَنیشەو کارە هونەری‌یەکانی بۆ زۆر زمانی تر وەرگێڕدراون. ئەم پارچە شیعرانە هی یەکەم دیوانیەتی بەناوی (دان پیانانی جۆنی بچکۆل) شیعرەکانیش پتر بە ناوەڕۆکن و فەرامۆشی سەرواو کێش دەکەن.

ڕۆژنامەی -گاردیان- دەربارەی نوسیوویەتی:
"یەکێکە لە چاکترین نووسەرە گەنجەکانمان."

**Brian Patten**
**Vanishing Trick**
**Ruskin House**
**(1976)**

## ئینگلتەرە

## "قەمبووری باخچەکە"

دیلان تۆماس

قەمبوورێک وا لەو باخچەیە
مرۆیەکی تەنیایە
بەنێو جۆگەلەو درەختەکان دا
ڕێ دەکاو خۆی دەگرێتەوە
لە دەروازەی باخچەکەوە
کە جۆگەلەو درەختەکان دێنە ژوورەوە
تا زەنگی یەکشەممەی ماتەمین
لە تاریکیا زرنگەی دێو.. دەنگ دەداتەوە
*
لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان نان دەخواو

لە جامێکی بە زنجیر بەستراویش..
ئاو دەخواتەوە
ئەو جامەی مناڵان وردە بەردیان تێخستووە
لەنێو ئەو حەوزەی بە سواری گەمییەکەم..
شەقیم کردووە
کە شەویش دادێ.. لە کولانە سەگێک دەنوێ
وەلێ بێئەوەی کەسێ بیبەستێتەوە
وەک مەلەکانی باخچە زوو دەرئەکەوێ
وەک ئاویش لەسەر زەوی ڕوودەنیشێ
منداڵانی لە شار هەڵەتەو ڕاکردوو
بانگی دەکەن: هێی کابرا.. کابرا
کە گوێی لە دەنگیان دەبێ.. زۆر ئاشکرا
دوورتر لەو دەنگە.. ئەو ڕادەکا..!

*

بە دەریاچەو شەقامی بەردین ڕادەبووری
ڕۆژنامەی دەستی ڕادەوەشێنێ.. پێ دەکەنێ
قەمبوورەو گاڵتەی بە دونیا دێ

بەنێو باخی پڕ شۆڕەبی بە دەنگ و هەرا
گوزەر دەکاو.. خۆی لە باخەوان لادەدا
ئەو باخەوانەی..
بە دارەکەی دەستی گەلاٌکان هەڵدەدا
پیرە سەگی تەنیاش
لەنێو چیمەن و قازەکان دا خەوتووە
کەچی منالاٌنی ژێر شۆڕەبییەکانیش
شەڕ بە پڵنگەکە دەفرۆشن
تا لەسەر شەقامی بەردینی پڕ بەرد
بنەڕێنیَو هەڵگەڕێتەوە
باخچەکەش لە دەریاوانان شین دەچێتەوە.
*
لەویَ ڕۆژ بەسەر دەبا تا زەنگ لیٌ دەدریَ
دەڵیٌی هێمای ژنێکە: بیَ گوناە بیَ
وەک دارکاژیش.. ناچەمێتەوە
بەو هەموو ئێسقانە خوارو خێچەوە
ڕێک و درێژتر لەو ئێسقانانە

کوورڕ نەبۆتەوە
شەوانیش.. دوای زنجیر و قفڵ و دەرگا کلیل دان
هەر ئاواو بەم تەرحە.. دەمێنێتەوە..!

*

هەموو شەوێ.. لەنێو باخچەی ژاکاودا
بەنێو شیشی پەرژینەکان
پنچک و نەمامەکان.. باڵندەکان
گیاوو گوڵ و.. درەختەکان..
بگرە تاکو دەریاچەکەش
منالآنی کێوی و چەتوون
ئەوانەی لە شلیک ناسک و پاکترن
ڕاوەدووی قەمبوور دەنێن
تا لەنێو تاریکیدا.. لە کولانەکەی دەپەستن

لە کتێبی: Modern American & British Poetry

## ئینگلتەرە

# "بەفرێکی نیان"

**بلێک**

(١٨٢٧-١٧٥٧)

ڕۆژێ بوو..
بەفرەباری و پیاسەم دەکرد
لە بەفری نیان پاڕامەوە یاریم لەگەڵدا بکا
ئەوەندەی یاری کرد تا دوا کلووی..
تواپەوەو نەما
وەلێ زستان..
ئەمەی بە تاوانێکی گەورە دانا

*

## "لێکچوون"

رانت ئاغاجان

ئەگەر گوڵی بەهار..
لە ڕوومەتی ئەو کچە نەچێ
پێم ناڵێی کێ خۆشی دەوێ..؟
گەر ئاسمانی شین..
لە چاوی ئەو کچە نەچێ..
دەبێ کێ سەرهەڵبڕێ و تێی بڕوانێ
گەر ئەو کچەش
وا جوانکیلەو پاک نەبێ
ئاخۆ چ مەزنێک بە بانانەوە دەمێنێ..؟

*

## "عیشق"

شەو ڕەنگینە..
پڕ لەززەتە شەو
بە پووش و پەلاش پۆشراوە
مەستانە.. بە ڕێگایەکی ڕۆشنا تێدەپەڕم
نەرمینە شەو.. چ پڕ لەززەتە
بە دەم دەریاو باوە ماچم بۆ دێن
لێرەو لەوێ.. ماچی ڕۆشن لە دەورما گوڵ دەگرێ
بە دەم دەریاو باوە.. ماچ
کەچی ڕۆشنایی دڵەکەم هێدی هێدی دەکوژێتەوە
لێویشم تامەزرۆی ماچێکی پیرۆزە
شەوی خۆشیش.. تریفەی مانگەو..
کەچی ڕۆشنایی دڵەکەم هێدی هێدی دەکوژێتەوە
*

## "دوای مەلە"

دوای مەلە.. با بە یەکەوە بڕۆین
بە تەنیایی.. لە کەنار ئەم دەریایەدا گوزەر بکەین
لەبەر گڕو تیشکی خۆردا
تا قژو ئەگریجەی تەڕت وشک دەبنەوە
با پێی پەتیت بخزێتە
نێو سینەی نەرمی ئەم لمە
هەر شەپۆلێکی تەوەللاش.. بێ هوودە
دەیەوێ ماچیان بکا
لێم گەڕێ مەستانە زارم بەم دەریایە تەڕکەم
بە ڕووی دەریای چاوەکانت
لە ژێر هەتاو.. لەسەر پانتایی شان و ملت
تا زوڵفانت وشک دەبنەوە
*

## "گۆرانی"

دەریا.. دەشت.. با.. گۆرانی دەچڕن
هەموو شتێ هەر گۆرانی و چرپەیە
دەریاو دەشت و با-ش گۆرانی دەچڕن
تۆ دەزانی دڵیش دەشت و بایە
کاتێ ئەم عیشقە غەمگینەم وەئاگا دێ
دەریاو دەشت و با-ش گۆرانی دەچڕن
هەرچی هەیە هەر گۆرانی و چرپەیە
*

## "بەیان"

وەک ڕۆژانی بەسەرچووم
وەک ڕۆژانی ڕابردووم
تەواو منیش بەسەرچووم
دارڕزام و پەڕوباڵم هەڵوەری
ئەوا ڕۆیشتم..
ئەمێستا مرۆڤێکی بەساڵاچووم
پیر بووم و جێیان هێشتم
وەلێ لەم ڕۆژە خۆشانەدا
کە "با"ش هەڵیکردووەو گڤەی دێ
دڵە جێماوەکەم
دەنرکێنێ و لە سۆزدایە

وا هەست دەکەم هێشتا گەنجم
وەک لەمەوبەر پێیان وتم
دڵیشم هەر گڕی جارانەو.. دادەگیرسێ..!

*

سەرچاوە

Baghdad obesrver ژمارە (٣٦٢٧)

## "گۆرانی"

وليەم سۆتار

کۆتايی لە سەرەتادايە

سەرەتاش لە کۆتايی

نە ژيان بردنەوەو نە مەرگيش دۆڕانە

ئەم بۆ ئەوی تريان بە بەڵێن و هاوپەيمانە

ئەو دەستەی کە دەبەخشێ

هەر ئەو دەستەيە کە دەيباتەوە

ئەو دەستەی دەيباتەوە

هەر ئەوەيە کە دەيبەخشێ

هەميشە لقی ئەو درەختەش دەشکێ

کە لەژێر بار گرانی ميوە..

يان بەفردا بێ..!

## "یاداشت"

لەنێو تاریکی منداڵدانێکەوە..

بۆ نێو پێخەف.. بۆ نێو ژوورێک

لەنێو باخچەوە ڕووەو شارێک

نێو وڵاتێک..

هەورازو نشێوی سەر ئەم زەمینە

تێکەڵ بە هەزاران.. ژن و پیاو

دیسانەوە بۆ نێو باخچەکە

باخچە.. ئەو ژوورە

ئەو پێخەفە.. ئەو گۆڕە

نێو تاریکی منداڵدانی ئەم دونیایە..!

*

## "نەما"

نەما ئەو زاتەی کە بۆ جوانی دەگریا
بەردێکی لە گەردنی خۆی بەست و خنکا
ئەو کەسەی بۆ عومری جوانی دەگریا
ئەمێستا..
هەمو ڕۆژێ گۆڕێک بۆ ڕاستی لێدەدا
ئەو زاتەی بۆ ساتانی خۆشی نوێژی دەکرد
پێ لە گوڵی سەر ئەم خاکە دەنێ و دەڕوا
ئەو کەسەی بەڵێنی لە ئەڤین ویستووە
وا ئیمڕۆ..
تا بینەقاقای لە قوڕی درۆ چەقیوە
ئەوەن مەگری و مەناڵێنە..
بە سەو ئەوەندەش ڕامەکە

ئەوەن بە دوای عیشق و خۆشیدا..

خۆت شەکەت مەکە

نەما ئەو کەسەی بۆ جوانی گریا..

تەواو ناوی سڕایەوە

ئەوەتا بۆ گوڵێکی بەردین.. وا چەمایەوە..!

*

## "نێرگزی"

پیاوێک بوو..

پیاوێک کە هەموو چیاکانی لە باوەش گرتبوو

باڵندەکانیش لەسەر لەپی دەسرەوتن

درەختەکانیش لەبەر پێیدا دەنووشتانەوە

ئەمیش بۆ مووفەڕکی

دەستی لە میوەجاتەکان دەدا

چی دڕندەی ترسناکیش هەن

لەژێر سێبەری باڵاکەیدا دەخەوتن

ئەو تەنها خەمی.. خزمەتی گوڵان بوو

تێکەڵ بە پیاوانیش نەدەبوو

ئەو پیاوانەی پێویستی بازاڕ کوشتوونی

ئەمی زۆر تەنیا..

هەنگاوی دووری دەنا

دوور لە خەم و گرفتی سادەی خەڵک و خوا..!

*

## "کە دەمرم"

کریستینا ڕۆزێتی

ئازیزەکەم.. گەر من مردم
سەردولکەم بۆ نەڵێی.. مەملاوێنە
لە ژوور سەریشم گوڵ مەڕوێنە
ناشمەوێ دارکاژ
سێبەر لە گۆڕەکەم بکا
گەر بۆت دەکرێ..
لەسەر سینەم سەوزە گیابە
کە بە ئاونگ و نمەی بارانێ..
شۆرابێ
گەر حەزت کرد یادم کە
حەزیشت نەکرد.. فەرامۆشم کە
***

ئەوسا کە دەمرم.. سێبەر نابینم
هەست بە نمەی بارانیش ناکەم
گوێم لە چریکەی هوزاریش نابێ
کە بە ئازارەوە دەچریکێنێ
لەنێو کازیوەی سپێدەیەکا
لە زەردەپەڕی ئێوارەیەکا
کە نەخۆر هەڵدێ و..
نە ئاوا دەبێ
هەر خۆم تەنیا خەون دەبینم
هەر بە ڕێکەوت.. ڕەنگە یادت کەم..
هەر بە ڕێکەوت.. ڕەنگە یادت کەم..
خۆ لەوانەشە لە بیرت بکەم..!

**

سەرچاوە:

The types of Literature
Francis Connolly

لاپەڕە (٢٠٦)

## "شەوو.. هەزاران چاو"

فرانسیس ولیەم بۆردلین

هەزاران چاوی هەیە.. شەو
کەچی ڕۆژ یەکێ شک دەبا
بەڵام ڕووناکی گشت دونیا
بە مەرگی ئەو خۆرە.. ڕادەکا..!

***

هەزاران چاوی هەیە.. سەر
کەچی دڵ یەکێ شک دەبا
بەڵام ڕووناهی گشت دونیا
بە مەرگی عیشقێک.. ڕادەکا..!

**

سەرچاوە: The Penguin Book
Of Love Poetry

## ئەمریکا

### "لەتەك ئەو دارستانەو لە ئێوارەیەکی بەفربارین دا"

رۆبرت فرۆست

دەبێ ئەو دارستانە هی کێ بێ..؟ وا بزانم..
کەلاوەکەی وا لەو گوندە
نامبینێ لێرە وەستاوم و.. دەڕوانمە
دارستانەکەی بەفری بەسەردا دەبارێ
***
ئەسپە ساواکەشم گوێ دەلەقێنێ و
سەری سوڕماوە
ئا لە نێوان دارستان و گۆمی پڕ شەختە
تاریکترین ئێوارەی ساڵ ڕاکشاوە

***

زەنگۆڵەی ملیم بۆ ڕادەژەنێ
ئاخۆ تۆ بڵێی بە هەڵەدا نەچووبم
تەنها دەنگێکیش کە کپی ئەم ناوە ڕامالێ
وژەی بایەو سرتەی بەفرە

***

دارستانیش چەندە کپ و تاریک و دڵگیرە
وەلێ بەچی ئەچێ..
کە من چەندەها کارو پەیمانم..
لەبەرەو.. دەبێ ڕایان پەڕێنم
چەندمیلێکیش بەر لە خەوتن..
کە دەبێ بیبڕم..

**

## ئەمریکا

# "دانیشتووم و.. دەڕوانم"

والت ویتمان

دانیشتووم و..
دەڕوانمە ئازاری هەموو دونیا
خەم و ستەم و بێ شەرمی
گوێم لێیەتی:
لە گریەو هەنسکی پڕ لە نهێنی ئەو گەنجانەی..
پەشیمانن لەو کارانەی کردوویانە..
هەر بەو دەردەش دەتلێنەوە..
دەبینم..
ئەو دایکەی مناڵەکانی دەیچەوسێننەوە
تەنیا جێماو
بێئومێدو داهێزراو

بە کولەمەرگی سەر دەنێتەوە..

دەبینم..

ئەو ژنەی مێردەکەی ئازاری دەداو..

دەیرەتێنێ

چاوم لێیەتی..

ئەو زاڵم و فێڵبازەی کچان لە خشتە دەباو..

دەیشەمزێنێ

ئەوەتانێ..

کڵپەی غیرەو..

سووتانی عیشقی یەک لایی

ئەو عیشقە دەبینم..

چ هەوڵێک دەدرێ..

سەرنگوم بکرێ

ئا لەنێو ئەم دونیایەدا..

ئەم هەموو ناڕێکییە دەبینم

دەڕوانم و دەبینم..

بەڵاو تاعوون.. شەڕو شۆڕ

دەردو دوو.. زوڵم و زۆر
چی‌یان بەم دونیایە کردووە
دەیانبینم..
هەموو بەندی و شەهیدەکان
نەهامەتی و برسیەتی نێو دەریاکان
لێمەوە دیارن:
دەریاوانان- بۆ ئەوە فاڵ دەگرنەوە
تا هەندێکیان بەر مەرگ کەون و..
ئەوانی تر بمێننەوە..!
دەیانبینم..
ئەو لووت بەرز و بە فیزانەی..
دەکەونە گیانی قولەڕەش و کرێکاران
پاڵەو برسی و هەژارەکان
دەیانبینم..
بە جوێن و قسەی ناشیرین.. دەیانشکێنن
چەند بە سووکی کەسانی ئاوا.. دەدوێنن
ئەم هەموو هەرایە..

ئەم هەموو پیسی و ئازار و دەردە کۆتایی نایە
دانیشتووم و.. هەروا لێیان ورد دەبمەوە
دەیانبینم .. ورد گوێ دەگرم
کەچی ئاوا.. کپ و بێدەنگ ماومەتەوە..!
**

لە کتێبی A Pocket Book of Modern Verse. Edited by Oscar Williams

## "قەلەڕەش"

ئێدگار ئالان پۆ

نیوە شەوێکیان..
نیوە شەوێکی زۆر ماتەمین..
شل و شەکەت و بێزار ڕادەمام
خەیاڵێ دەی هێنام و.. خەیاڵێ دەیبردمەوە
هەر بە دەم ئەو خەیاڵەوە
لە حیکمەتی دێرین و لە یادچووی کتێبێک..
ورد دەبوومەوە
بە دەم خەوەوە وەنەوزم دەدا.. بەم لاو بەو لادا دەکەوتم
دەنگێکی نزم..
کت و پڕ هاتە بەرگوێم و بێدار بوومەوە
وەک کەسێ هێواش لە دەرگا بدا

به ئاستەم لە دەرگای ژوورەکەم بدا
چرپاندم.. وتم:
"میوانەو لە دەرگای ژوورەکەم دەدا..
ئەوەو هیچی تر نەهات بە دوایدا.."
ئاه.. جوان دێتەوە یادم.. وەک ئێستا
لە "بەفرانبار"ی ساردو تەزیوی بە ڕەشەبا
هەر پشکۆیەکی تەنهاو مردوو
سێبەری مەرگی.. لەسەر زەوی جێهێشتبوو
پڕ بە دڵیش خۆزگەم دەخواست..
چاوەڕوانی بەیانی بووم
بێ هوودە بوو..
بۆ کۆتایی خەم و مەینەتیم لەنێو کتێبەکان دا..
ون دەبووم
خەم و مەینەتی بۆ "لینۆر"ی لە دەست چووم
بۆ ئەو شۆخە بێ هاوتایەو..
ورشەدارەی..
فریشتەکان بە ناوی "لینۆر" بانگیان دەکرد

کەچی ئیتر بۆ هەتا هەتایە

ئا لێرەدا ناوی نایە..!

***

ورشەی پەردەی ئاوریشمینی چون ئەرخەوان

دەرژێ لەگەڵیا چپەی خەم و دەردو گومان

موچرکە دەخاتە سەراپای گیان

ترسێکی ئەفسووناوی سەیر دامدەگرێ

ترسێک.. لەمەوبەر قەت نەمدیبێ

هەر لەتاو تینی ئەو ترسە..

هەڵدەستمەوە سەرپێ

بە خۆم دەڵێم.. دەیڵێمەوە

تا کوتە کوتی دڵ بوەستێو.. ئارام بێتەوە:

"میوانێکەو دەرگای ژوورەکەی لێگرتووم..

دەپاڕێتەوە

میوانێکی درەنگ وەختەو لەبەر قاپی ژوورەکەمدا..

وا بە دڵ دەکرووزێتەوە

هەر ئەوەیەو.. دەبڕێتەوە.."

***

دەرحاڵ ڕۆحم گەشەی کردو.. پرزەو هێزم هاتەوە بەر
نەوەستام و.. بێ دوودڵی.. دەنگم هەڵبڕی
پێم وت: "بەگم.. یان..، هۆ خانمەکەم
لە دڵمەوە داوای لێبوردن دەکەم
من تازە چاوم دەچووە خەو..
کە تۆ لە دەرگات دەدا..
بە ئاستەم
هێواش هێواش لە دەرگات دەدا..
دەرگای ژوورەکەم
بێئەوەی پڕ بە گوێ هەستی پێ بکەم..
دەرگام بۆ خستیتە سەرپشت
کە ڕوانیم جگە لە تاریکی..
هیچ شتێکی دیکەم نەدی..!

***

زۆر لەوێ وەستام..
بە هەردوو چاو لە قووڵایی تاریکی ڕادەمام

سرو سەرسام.. دەلەرزیم و دەترسام
بەدگومان و شڵەژاو..
ئەو خەونانەم دەهاتنەوە بەرچاو
بەر لە من ڕۆح لە بەرێ نەیدیبن
وەلێ شتێ بێ دەنگی ئەو ناوەی نەدەشکاند
چرپەیەک خامۆشی نەدەزڕاند
تەنها وشەیەک بە دەنگی چپە دوو..
چرپەی ناوی "لینۆر" بوو
"لینۆر؟".. منیش چرپاندم.. چپەی ناوی هاتەوە بەرگوێم
"لینۆر!" هەر تەنها ئەوەو هیچی تر..!
هەموو گیانم دەسووتا.. گڕ لە دەروونم هەڵدەستا
بۆ نێو پێخەف گەڕامەوە..
دیسانەوە.. توندتر لە دەرگای دایەوە
وتم: "بێشک.. شتێ هاتۆتە سەر پەنجەرەکەم
کەواتە با بزانم.. ئەم نهێنی‌یە بدرکێنم
تا دڵم بسرەوێ.. با ئەم تەلیسمە بشکێنم-
وەلێ جگە لە ڕەشەبا..

من هیچی دیکە نابینم..!"

***

توند پەنجەرەکەم کردەوە..

قەلەڕەشێک.. باڵی لێکداو بە فرەفرٍ هاتە ژوورەوە

قەلەڕەشێکە بە هەواو فیز و مەزن..

شیاوی ڕۆژانێکی دێرین و پیرۆزی جەژن

بێ ڕاز و سلاّو.. بێ نووشتانەوە..

بێ وەستان و لێکدانەوە

بە هەواو فیزی لۆرتێکەوە..

بە نازو نووزی خاتوونێکەوە

هات و لە سەرووی دەرگا..

هەڵنیشت و باڵی لێک نا

لە بان پەیکەری "پالاّس"ی سەر تاقی دەرگا

لەوێ قوت و مت هەڵتووتا

هەر ئەوەو هیچی تر.. نەمدی پتر..!

***

ئەوسا باڵندەی ڕەنگ ئەبەنووسی.. دڵی دامەوە

خەون و خەیاڵی پڕ لە خەمی.. ڕەواندمەوە
لەسەر لێوانما زەردەخەنەی چاند..

گەرچی لەنێو ڕەنگی ڕەش و ناشیرینی پرسەداران..
خۆی دەنواند
پێم وت - "ئەگەرچی تۆ بێ پۆپنەش بیت..
وەلێ خۆ هەرگیز ترسنۆک نیت
ئەی قەلەڕەشی ئەرژەنگ و پیر و دڕو خێو ئاسا
ئەی پەراگەندەو تەریوی کەنارانی تاریکی دەریا
پێم بڵێ - "بە چ ناوێکی لۆردانەو مەزن..
لەوێ.. لە تاریکی شەوی دۆزەخیدا..
ناوت دەهێنن
دەرحاڵ قەلەڕەشی بۆر..
وەڵامی دامەوە -نێڤەرمۆر!"
سەرم سوڕما.. چۆن وا شیرین مەلێکی ئاوا ناشیرین..
گوێم لێ دەگرێ
گەرچی وەڵامەکەیشی دووره ماناو.. کەم پەیوەندی بێ

بەر لە من.. هیچ ڕۆح لەبەرێ نەیدیبێ
پەلەوەرێ بەهاتنی پیرۆزی کاو..
لەسەر تاقی دەرگاکەیدا هەڵبتووتێ
باڵندە.. یا گیان لەبەرێکی نەگریس بێ..
بێو.. لەسەر پەیکەری دەرگا هەڵبنیشێ
ناوی چی بێ.. "نێڤەرمۆر" بێ..!

***

وەلێ قەلەڕەشی تەنیا.. لەسەر پەیکەری بێ دەنگی
کە هەڵنیشت..
هەر تەنها ئەم وشەیەم لێ بیست
هەروەک بڵێی ئەم وشەیە هەموو ڕۆحی هەڵمژیبێت
بۆ تەنها جارێکی تر نەیقیڕاند.. تەنها پەڕێکی نەبزواند
تا من بە چرپە وتم - "بەر لەو زۆر هاوڕێی ترم هاتن و ڕابردن..
بەیانی ئەویش جێم دێڵێ
وەک هەموو هیواکانم.. دوور فڕین و تێکڕا مردن
دەرحاڵ قەلەڕەش وەڵامی دایەوە-

"هەرچی چوو.. نەگەڕایەوە..!"

***

لەو خامۆشی‌یە دەترسام..

که زەنگی وەڵامێکی ئاوا بەجێ بیزرێنێ

به خۆمم وت:

"لەوە بێشکم.. ئەوەی قەلەڕەش کردی و.. وتی..

تاکە سەرمایەو دوا گەنجینەی بیری خۆیەتی

کە دەشێ.. پیاوێکی سیاچارەو نیگەران فێری کردبێ

پیاوێ.. چارەنووسی ڕەشی خۆی.. لێرەو لەوێ

بێبەزەییانە.. خێراو.. خێراتر ڕەدووی کەوتبێ

تا وای لیٚ کردبێ.. گۆرانیەکانی بێ ئیقاع و ڕەزم بێ..

لەسەر یەک ئاوازی خەم بڕژێنە بەرگوێ

بالۆرەی شین و ماتەمینی هیواکانیشی..

هەر هەمان نەغمەی خەم و ژانیان هەڵگرتبێ

ئەو تەنها نەغمە بۆن گرتووەی گۆڕ

نەغمە غەمگینی "نێڤە".. نێڤەرمۆر"

قەلەڕەش دیسانەوە..

خەیاڵی پڕ پەژارەی لێ سەندمەوە..

بزەو خەندەی دەدامەوە

دەرحاڵ کورسی‌یەکم هێنا..

بەرامبەری قەلەڕەش.. پەیکەرو دەرگا

بێدەنگ قاچم لێ ڕاکێشا..

پاشان.. لەسەر مەخمەری کورسی نەرم و نیان

خەیاڵم بە دەم خەیاڵەوە گرێ دەدان

ئاخۆ مەلی پیرو بەدفەساڵ و خەمهێنی شووم

مەلی وا ناشیرین و پەڕپووت و خێو ئاسای بە دیووم

ئاخۆ مەبەستی چی بوو قەلەبۆر..

کە بۆی قڕانم - "نێڤەرمۆر..!"

***

نقەم نەکرد و لێی دانیشتم..

کەوتمە مەزەندەو تەخمین و خەیاڵ..

چی گەرەکە با بزانم

گڕو بڵێسەی چاوەکانی ناخ و ڕۆحی دەسووتاندم

ورد بوومەوە تا تێی بگەم.. پێشبینی نەگبەتێ بکەم

سەرم خستبووە سەر بالیفی بەرگ نەرمی مەخمەری
که بارانی پرشنگی چرا جوان بەسەریا دەباری
وەلێ مەخمەری وەنەوشەیی ژێر شەوقی چرا
ئاخ و سەد داخ چی لێ ناکا..!

***

دوایی لای خۆم وام هەست دەکرد..
بخوری نێو بخوردانێکی بزر.. بۆنی هەوای خۆشتر..
دەکرد
فریشتەیەکی نزیکی خوداوەندیش..
بخوردانەکە دەباو دەهێنێ
فریشتەیەک بنی هەردوو پێیەکانی لە سینەی زەوی بخشێنێ
بای دەدات و دەیسوورێنێ
هاوارم کرد:
"تۆ ئەی بەدبەخت و چارەڕەش..
سەیرکە خوا چی بۆ کردی.. بە فریشتەکانیا چی بۆ ناردی:
حەوانەوەو سێبووری دەردی تەنیایی
شەرابی خەم ڕەوێن و دڵنەوایی..

بادەی ئازار لابەری یادی لینۆرو جودایی
هەڵیدەو بە یەک بین ئەم شەرابە نۆش کە
خەمی کۆچی لینۆری جوان فەرامۆش کە
دەرحاڵ قەلەڕەش وەڵامی دایەوە:
"هەرچی ڕۆیشت.. نایەتەوە..!"
***
پێم وت- "ئەی پێغەمبەر.. هۆ ڕۆحی شەڕ..
تۆ کامیانیت..؟
گەرچی تۆ پێغەمبەریش بیت.. یان شەیتان و.. یا پەلەوەر بیت
گەر ڕەشەبایەک بۆ ئێرەی ناردی..
یان ئەهریمەنێک دەری کردی
کە لێرە وا تەنیاو پەستی.. گەرچی ئازاو سەرسەختی
لێرە لەم بیابانە.. کە پڕ سیحرەو پڕ ئەفسانە
لێرە.. لە ماڵی وا پڕ سام و ترسم.. تکا دەکەم..
لێت دەپرسم:
ئاخۆ لای یەهوزا-ش هیچ مەرهەمێ چنگ دەکەوێ
ژان و ئازارم لابەرێ..؟

قەلەڕەشی بە هەواو فیز..
دەرحاڵ وتی - "هەرگیزاو هەرگیز..!"
***
پێم وتەوە - "هۆ پێغەمبەر.. یا ڕۆحی شەڕ..
تۆ کامیانیت..؟
گەر تۆ پێغەمبەر.. یان شەیتانیت.. یا پەلەوەر
سوێندت دەدەم.. تو ئەو ئاسمانەی ژوور سەرمان
تو ئەو یەزدانەی کە سەروەرە بۆ هەردوومان
بەم ڕۆحە خەمبارەم بڵێ.. کە لەژێر باری خەم و ژاندا دەنرکێنێ
ئاخۆ لەگەڵ ئەو شۆخە چاکە.. ئەو کچە پیرۆز و پاکە..
دەکەینەوە دەست لەملانێ..؟
دە پێم بڵێ: ئاخۆ لەوێ.. لە بەهەشتی دووری "عەدن"
کە پەرییەکان ئەو جوانەم بە ناوی "لینۆر" بانگ دەکەن
ئاخۆ تێر دەیگرمە باوەش..ئەو شۆخی وا درەخشان و گەش.؟
کەچی قەلەڕەشی بە هەواو فیز..
بۆی قڕانم " هەرگیزاو هەرگیز.."
کە کت و پڕ زریکاندم- "گەر پەلەوەریت یا ئەهریمەن..

با ئەوەیان دوا وشەی جودایی بێ.. دوا دەنگی ماڵئاوایی
بگەڕێوە نێو زریان و باوو بۆران.. نێو شەوی دۆزەخی و
تاریکی کەناران
هیچ پەڕی ڕەشی تۆم ناوێ.. بەجێی بێڵی
وەک یادێکی ئەو درۆیەی کە لێرە ڕۆحت درکاندی
بەجێم بێڵەو.. بێ دەنگیم لێ مەشڵەقێنە
دەی دەنووکت لەو گۆشتەی دڵم دەربێنە..
بەسە.. ئەم بەر دەرگایەم لێ مەگرە..
ئەم پەیکەرە بەجێ بێڵەو بۆ خۆت بفڕە
قەلەڕەشی بەهەواو فیز..
دەرحاڵ وتی: "هەرگیزاو هەرگیز"
***
هەر لەو ساوە قەلەڕەش..
لە بان پەیکەری "پالاس"ی زەردباوی سەر دەرگاکەم..
هەڵنیشتووە
هەرلەوێیە..
قەت نافڕێ و مت و بێ دەنگ دانیشتووە

خۆ چاویشی لە چاوی شەیتانێک دەچێ..

شەیتانێک خەون ببینێ..!

کە قەلەڕەش..

تیشکی چرای بەردەکەوێ..

سێبەرەکەی بەو ناوەدا دەڕژێ و دەکشێ

ڕۆحی منیش قەت لە بازنەی ئەم سێبەرە..

نابێتەوە

هەرگیزاو هەرگیز هەڵنافڕێ و بۆم بێتەوە..!

**

**تێبینی:** [نیڤەرمۆر- Nevermor ] وشەیەکە لە کۆتایی زۆربەی کۆپلەکاندا دووبارە دەبێتەوە.. واتاکەشی (هەرگیزاو هەرگیز) دەگەیەنێ یاخود بە واتایەکی دیکە (ئەوەی چوو.. ناگەڕێتەوە) بەڵام خۆی وەك مانـاو دەنگ (پۆ) بایەخێکی تەواوی بەم وشەیە داوە.. بۆیە زۆر لە وەرگێڕە عەرەب و بیانییەکان لەو باوەڕەدان وشەکە وەك خۆی بە ئینگلیزی بنووسرێتەوە.. هەندێکی تریش ڕایان وایە کە وەك واتای خۆی وەربگێڕدرێتە سەر زمانێکی دیکە.. بەڵام من -بە گشتی- لە وەرگێڕانی ئەم شیعرەدا تا سنوور و خواستی شیعر سەربەستیم بە خۆم داوە.

لە کتێبی (Stories. Edgar Allan Poe)

## ئەمریکا

## "زەنگەکان"

ئێدگار ئالان پۆ

(١)

بۆ زرنگەی ئەو زەنگانە.. گوێ ڕادێرە-
زەنگی زیوین..!
سەداو ئاواز و دەنگی.. پێشبینی چ دونیایەکی بەختەوەر
دەکات..!
وەی لە زرنگەی.. زرنگ.. زرنگ.. زرنگ
بەنێو هەوای شەوی زۆر سارد و تەزیودا
ئەو زەنگانە چۆن زرنگەیان دێت
لە هەموو ئاسمانی ئەمشەویشدا چ ئەستێرە بارانێکە
لەگەڵ زرنگەی زەنگەکان دا
وەک شیعرێکی پڕ نەغمەو.. بەسەرواو کێش

بە یەکەوەو.. لە یەک تاودا
بە زەوقێکی چەندە ساف و کریستالی‌یەوە..
ئەستێرەکان چاو دەتروکێنن و دەدرەوشێنەوە
لە زەنگەکانەوە دەنگێ دێ.. زەنگەکان.. زەنگەکان.. زەنگەکان
زەنگ.. زەنگ.. زەنگ
زایەڵەی زەنگەو.. خرۆشی مۆسیقایەکە هەڵدەقوڵێت-
لە زرمەو زرنگەی زەنگەوە چ دەنگێک دێت..!

*

(٢)

زرنگەی کەرخ و ناسکی زەنگی شایی‌یەو.. گوێی بۆ شل کە زەنگی زێڕین..!
ڕەزم و لەرەی پڕ لە ئیقاعی.. دونیایەک خۆشنوودی پێیەو
بە خوڕ دەڕژێت
بەناو هەوای فێنکی ئەمشەودا
لە بری هەوەسی ئەو هەموو بەزمە.. زەنگەکان چۆن زرمەیان دێت

لە گەرمەی گۆرانی و مۆسیقای وا ڕەنگین،
بە یەک ئاواز و یەک نەغمە،
چ شل.. چ ناسک ئەو بەستە وا خۆش هەڵدەستێت
بۆ ئەو قومریەی وا گوێی گرتووە،
چەندە بە شادی لە مانگ دەڕوانێت
تەحا.. لە قووڵایی بنەبانی دێری پڕ لە دەنگ دانەوەدا
ئاوازێکی چەندە شیرین.. وا بە پڕی هەڵدەقوڵێت و گوێ پڕ دەکات
چەندە بە سۆز.. سەدا فرەو.. بەرز دەڕوات
چۆن دەڕوات و چۆن دێتەوە
بەسەر ئایندەدا کە دێتەوە
ئەو باسە دەیگرێتەوە
باسی خۆشی ئەو بەزمە گەرمە
کە زەنگی هێناوەتە سەر سەماو زرمە
زرنگەی زەنگەو هەروا دەڕژێت.. زەنگەکان
زەنگەکان.. زەنگەکان.. زەنگەکان
وەی لە ئیقاع و نەزم و مۆسیقای لێدانی ئەو زەنگانە..!

*

(٣)

گوێ ڕادێرە.. هاڕەو زرمەی زەنگی ترسە..زەنگی مسین..!
وا شپرزەو شڵەژاو.. چیرۆکی بێ ئۆقرەیی چ ترسێک دەگێڕنەوە
لەنێو گوێی شەوی پڕ ترس و تۆقیودا
زارەترەک بوون.. لە قیژەو هاوارو زریکە چیتر نییە
ئەوەندە واق وڕماوو.. هەترەش چوون
سرۆسام گرتوو.. دەمیان گۆ ناکات
تەنها شتێک کەوا بیکەن
وا بێ نەغمەو وا بێ ئاواز دەزریکێنن
چەندە ناساز دەزریکێنن
وەک هارێک هانا بۆ ڕەحمەتی ئاگر ببات
یا شێتانە لەگەڵ ئاگری کەڕو هاردا.. دەستەویەخەی
یەکدی ببن
بەرز.. بەرز و بەرزتر ڕووەو ئاسمان کڵپە بسێنن
بە ئارەزوویەکی پڕ لە نائومێدی
هەوڵێکی بێ پایانەوە

ئێستا - هەر ئێستا لەتەک مانگی ڕوو زەردا
ئۆقرە بگرن
ئەگینا بۆ هەرگیزاو هەرگیز پێ ناگەن و..
هەروا دەبن
ئای.. ئەی زەنگ.. ئەی زەنگ.. ئەی زەنگ
ترست چ چیرۆکێکی نائومێدی و دڵتەنگی دەگێڕێتەوە
وەی لە نائومێدی و دڵتەنگی..!
کە هاڕەو زرمەی لێ هەڵدەستێ.. بە یەکا دێن و دەزرنگێنەوە
چ ترسێک دادەبارێ و بەخوڕ دەڕژێ
بەسەر سینەی ئەو هەوایەی کە دڵە کوتەیەتی و دەلەرزێ
کەچی گوێ.. باش دەزانێ
لە زرمەو لە لێدانی
لە زرنگەو لە کوتانی
کە چۆن دەریای ئەم مەترسییە تاوێک لافاو دەهێنێو تاوێکی دی دەیباتەوە
وەلێ.. گوێ زۆر لای ئاشکرایە

لە دەنگی ناساز و ناقۆڵاو.. وا قورسی
لە هەراو بە یەکاچوون و زایەڵەی پڕ ترسی
چۆن ئەم ترسە تاوێک نوقمەو تاوێک سەرئاو
بەیەکەوە
لەگەڵ نوقم بوون و هەڵسانی تورەیی ئەم زەنگانە ئای لە تووڕەیی ئەم زەنگانە
ئای لە تووڕەیی ئەم زەنگانە
زەنگەکان.. زەنگەکان.. زەنگەکان
کە تێکەڵ بە ژاوە ژاوو هاڕەو زەناو زرمەو زرنگەی ئەو زەنگانە دەبێت..!

(٤)

گوێ لە لێدانی زەنگەکان بگرە-
زەنگی ئاسنین..!
دونیایەک بیرو هەستی پڕ خەم و شیعری ماتەمینی..
هەڵگرتووە
لەژێر خامۆشی شەوی کپ و..

لەتاو هەڕەشەی پڕ پەستی کە لەو نەغمەوە دێت
کەوتینە دانەچۆقەو دەلەرزین
چونکە هەر دەنگێک کە لێوەی هەڵدەستێت
ئاهو ناڵەیە..
لە قوڕگێکەوە ژەنگی گرتبێت
کەچی خەڵکیش -ئۆف لە دەست خەڵکی-
لە بورجی سەر کەلیسەکان دوورەپەرێز مت دانیشتوون،
هەریەکەی بۆ خۆی.. بە تەنها،
لە ئاوازێکەوە دەژەنێت،
کپ و خنکاو.. لەگەڵ ئەو ئاوازەی لەسەر یەک پێو دان
لێدەدەن و.. لێی دەدەن و.. هەر لێی دەدەن..
دەزرنگێتەوەو دەزرنگێتەوەو دەزرنگێتەوە
لە هەنگاونانیاندا بەسەر دڵی هەموو مرۆڤایەتی
هەست بە نەمری و مەزنی دەکەن-
دڵی مرۆڤایەتی- ئەو دڵەی کە بەردەو داتاشراوە
ئەوانە نە پیاون و نە ژنیشن-
نە ئاژەڵ و نە ئادەمیشن

هەموو هەر دێوو درنجن
پادشای هەمووشیان زەنگەکە لێدەدات..
تلۆر دەبێتەوە.. خزەو.. هات.. تلۆر-
دەبێتەوە.. تلۆر
بووەتە سروودی سەرکەوتن و بەسەرمان دا دادەڕژێ
بەو سروودی سەرکەوتنەی لەو زەنگانەوە هەڵدەڕژێت
سینەی پڕ لە کەیف و هەوەسی هەڵدەئاوسێت
هەڵدەپەڕێ و سەما دەکات.. دەقیژێنێت
بە یەکەوەو.. لە یەک ساتدا
دنگ.. دنگ.. دنگ
وەک شیعرێکی پڕ نەغمەو کێش
لەگەڵ ئەو سروودەی لە زەنگەکانەوە دەکەوێت..
لە زەنگەکانەوە-
بە یەکەوە.. تک.. تەک.. تک.. تەک
شیعرێکە پڕ نەغمەو کێش
لەگەڵ لێدان و کوتەکوتی دڵی ئەو زەنگانە-
زەنگەکان.. زەنگەکان.. زەنگەکان

لەگەڵ ئاهو زارو گریەی ئەو زەنگانە

به یەکەوە.. دینگ.. دینگ.. دینگ

زەنگ بۆ مەرگ یان کارەساتێکی زۆر مەزن

لێدەدات و لێ دەدات و هەر لێ دەدات

به ئیقاع و نەزمێکی شیعری و شادانە

لەگەڵ قوڵپ دان و ڕژانی زایەڵەی ئەو زەنگانە

ئەو زەنگانە.. زەنگەکان.. زەنگەکان.. زەنگەکان

به یەکەوە لەگەڵ زرمەی لێدانی ئەو زەنگانە..

زەنگ.. زەنگ.. زەنگ

وەی لە زریکەو ناڵەو ڕۆڕۆی ئەو زەنگانە..!

**

لە کتێبی

The New Pocket Anthology
Of American
Verse

## ئەمریکا

## "ئاگرو سەهۆڵ"

رۆبرت فرۆست

هەندێ دەڵێن: دونیا بە ئاگر دادەرمێ
هەندێکی تر دەڵێن: سەهۆڵ
لەو ئارەزووانەی خۆمەوە کە چەشتم
لەگەڵ ئەوانەم دەڵێن: ئاگر
بەڵام گەر بلوایە دووجار تێک چێ
دەڵێم سەهۆڵ بۆ رمانی
مەزنترە..
جێی خۆیەتی و.. زۆر راسترە.
*

## ئەمریکا

## "کچێك"

ئێزرا پاوند

لق و پۆپی..
ئەو درەختە لە دەستەکانم چەقین
خوێنی ڕژایە باسکەکانمەوە
ئەو درەختە لە سینەما سەوز بووە
بە ناخما شۆڕ بۆتەوە
لقەکانیشی وەک باسکەکانم.. لە منەوە ڕواون

*

تۆ درەختیت..
تۆ قەوزەییت
وەنەوشەیت و بەڕووی "با"دا دەشنێیتەوە
تۆ مناڵیت.. وەلێ مەزنیت
ئەوانەش هەمووی.. هیچیان هیچ نین بەڕووی دونیا

## ئیسپانیا

# "ژنێکی بێ ئەمەك"

لۆرکا

هەتا گوێ ڕووبارەکە بردم..
وام زانی هێشتا کچە
کەچی ژنێکی بەماڵو مێرد بوو
شەوی موبارەکی یاقووب پێغەمبەریش بوو
هەروەک بڵێی ژوانمان هەبووبێ
چراکانیش کوژابوونەوە
گوڵ ئەستێرەکان داگیرسابوون
دوور لە قوژبنی کۆڵان و جادەکان
دەستم بۆ هەردوو شەمامەی نوستووی
سەر سینەی برد
دەرحاڵ بۆم کرانەوەو پشکووتن

دەتووت دوو هێشووە یاقووتن
ورشەی ئاوەڵ کراسەکەشی لە گوێما..
دەزرنگایەوە
چون پارچە قوماشێکی ئاوریشمین
بە دەیەها چەقۆ لەت و پەت بکرێ
درەختەکانیش..
بێ تیشکی زیوینی سەر گەڵاکان باڵایان دەگرت
لە دووری ڕووبارەکەوەش..
بە پانتایی ئاسۆ.. سەگ لە وەڕین نەدەکەوت
بەنێو چەندەها تووتڕک و..
دڕک و داڵ و پنچکدا.. گوزەرمان کرد
بە قەد قژی تۆپەڵ کراوی پشتی سەری..
زەوییەکەم پێ چاڵ کرد
من قەرەوێتم فڕێدا..
ئەو کراسەکەی
من.. قایشی پشت و.. دەبانچە
ئەو سینەبەست و سووتیانەکەی

ئای لەو پێستە ناسک و جوانەی
مرواری چیو.. نێرگز کەی دەگا پێی.. کەی
هیچ ئاوێنەیەکی زیوین ئاوا نابرسکێتەوە
هەردوو ڕانی لەبەردەستم هەڵدەهاتن
دەتوت جووتێ ماسی سرک و ترسنۆکن
نیوەی سارد وەک سەهۆڵ
نیوەی پڕ گڕو ئاگر
ئەو شەوە..
بەسەر خۆشترین ڕێگاکانی ئەم دونیایە..
گوزەرم کرد
سواری ماینێک بووم لە مرواری
ماینێکی بێ ڕێشمەو جڵەو و ئاوزەنگی
من پیاوم..
لام نەنگە ئەو شتانە بگێڕمەوە.. ئەو شەوە وتنی
ڕۆناهی لە یەک حاڵی بوون
گەلێ بە نەزاکەتی کردووم
نوقمی خۆڵ و لم و ماچ

ڕووەو گوێ ڕووبارەکە بردم
باڵای گوڵە سەوسەنەکانیش
لەگەڵ -با-دا بەشەڕ دەهاتن.

*

من وەک ویستی خۆم ڕەفتارم کرد
وەک قەرەجێکی بێ غەوش و ڕەسەن
قوتووی -درووومانم- پێش کەش کرد
کە لە ئاوریشم پێچا بووم
ڕەنگی لە ڕەنگی -کا-ی دەکرد
نەکەوتمە داوی ئەوینی‌یەوە
چونکێ کە ڕووەو ڕووبارەکە بردم
گەرچی بە ماڵ و مێردیش بوو
کەچی پێێ وتم:
"من هێشتا کچم..!"

**

لە کتێبی:
The Selected Poems of Lorca
Edited by Francisco Donald
لاپەڕە (٦٩-٧٣)

## "لاوانەوە"

<u>لۆرکا</u>

هەموو پەنجەرەکانم داخست
چون نامەوێ گوێم لە گریان بێ
بەڵام لەودیو دیوارە بۆرەکانەوە
جگە لە ناڵەو گرین.. گوێت لە هیچ نابێ..!

*

زۆر کەمن ئەو فریشتانەی گۆرانی دەچڕن
زۆر کەمن ئەو سەگانەی دەوەڕن
کەچی هەزارەها کەمانچە
بۆ دەست و پەنجەی من.. ڕامن..!

*

وەلێ گریان سەگێکی زرپ و زەبەللاحە

فریشتەیەکی گەلێ گەورەیە

کەمانجەیەکی فرە قەبەیە

فرمێسکەکانیش بەردی -با- دەگرن

گوێت لە هیچی تر نابێ

**

## "سترانی زەریا"

لۆرکا

زەریا.. زەریا..

لە دوورەوە زەردە دەیگرێ

کەفچڕی شەپۆڵەکان ددانیەتی

ئاسمانی سەرووش لێوەکانی

**

هۆو.. کچی شێواو.. دەروون پڕ گێژەن

پێم نالێی تۆ..

کە سینەی وڵات داوەتە بەربا

گەرەکتە چی بەو خەڵکە بفرۆشیت؟

من دەڵێی گەورەم:

ئاوی زەریا..!

**

هۆو تۆ.. هۆ کوڕە ڕەشتاڵەکە

پێم ناڵێی تۆ..

لەنێو ئەو خوێنە ڕەشەت چیت هەڵگرتووە..؟

من دەڵێی گەورەم:

ئاوی زەریا..!

هۆ دایە گیان..

پێم ناڵێی ئەو فرمێسکە سوێرانەی تۆ

لە کوێوە دێن و.. سەردەکەن..؟

-ڕۆڵە.. قەتارەی فرمێسکەکانیش..

هەر ئاوی زەریان.

**

ئەی دڵ..

ئەی تاڵیی وا کوشندە
لە کوێوە سەری هەڵدا..؟
-لە تاڵیش تاڵتر هەر ئاوی زەریا

**

زەریا.. زەریا
لە دوورەوە.. زەردە دەیگرێ
کەفچڕی شەپۆڵەکان ددانیەتی
ئاسمانی سەرووش لێوەکانی

**

لە کتێبی The Selected Poems of Garcia Lorca

## "خۆشم ویستی"

پوشکین

خۆشم ویستی..
ئەمێستاکەش.. ئاشکرا دەیڵێم خۆشم ویستی
ئەمێستاکەش..
هەندێ پشکۆی ئەو ئەوینەم هەر دەسووتێن..
نەکوژاونەتەوە
دەبا ئەو حەزە نەبێتە مایەی حەسرەت و..
خۆت بخۆیتەوە
نامەوێ چیتر غەمگین و مات تۆ ببینم..
بتلێیتەوە
هەرچەندە بێ هیواو بەستەزمان بووم..
کەچی هەر خۆشم ویستی

وەک عاشقێکی ترسنۆک و لێوە لەرزە
غیرە بکاو بەو ئازارە بتلێتەوە..
خۆشم ویستی
چەندە ناسک.. چەند بە ڕاستی..
کەوتبوومە تۆ پەرستی
داوام وایە لە خوا.. تۆ تووشی ئەوینێکی وا بکا..!
*

**قەرغیزیا**

## "سواری گالیسکەی هەچ کەسێك بووی گۆرانی ئەو بچڕە"

**خەلیمەت بێراموکۆڤا**

دەڕۆم و لە ڕێگەما هیچ گالیسکەیەک نابینم
سواری عارەبانەیەکی گا دەبم
عارەبانچی کەوتۆتە سەر چەقەنەو گۆرانی
منیش.. گۆرانی خۆم دەچڕم
دەزانم گۆرانییەکەی ئەو زۆر خۆشە
بەڵام چی بکەم هی خۆم خۆشتر
دیارە هەر لەبەر ئەوەبوو..
لە لاڕێی وا بەردەڵان
چوست وەستاو تەنیا جێی هێشتم-
دیسانەوە ئەم ڕێگەیە بەپێ دەبڕم

عارەبانەی بەتاڵیش بە بەرچاومەوە..

غل دەبۆوە

کەواتە دیسانەوە.. پیادەو تەنیام

دەزانم سترانی ئەو زۆر خۆشە..

وەلێ چی بکەم هی خۆم خۆشتر..!

لە کتێبی The Tender Muse

## "وەرە ژوان"

**ماریا پێترۆڤیخ**

وەرەو با ژوانێ ببەستین
لە ئێستا درەنگتر نا
ئا لەم سەدەی بیستەمەدا-
وەرە بەڵێنی ئەم دیدەنیە
بێ ئەوینت من هەناسەم گەلێ تەنگە
یادم کەرەوە.. تەلفونێک.. دەی جووڵەیەک
دە وەرە ژوانم..
لە شارێکی ئەم باکوورە
لەو شارەی ڕەشەبا گڤەی دێ و
بێ بەزەییانە لە گردۆڵکەکانی دەدا
لەو شوێنەی دەریا شڵپ و هوڕییەتی

شەپۆڵەکانی پڕن لە ڕەنگ و ڕوناهی پەلکەزێڕینە
لەو شوێنەی دڵم نەدەگریا
بۆ ئەو حەزەی هەر مایەوەو لە بیر نەکرا
نهێنی یەکەم دیدەنی.. ئاخۆ هەر لە بیرت ماوە..؟
ئەو کاتەی لە کۆنە کەلاوەکانی دەرەوەی شاردا سوڕمان دەخوارد
ناو ئەو خانووە چکۆلانەی پەسترابوونە پاڵ یەکتری
توولەڕێ باریکەکانی دەهاتنەوە سەر یەکدی
لەو شوێنانەی خەڵکی بە زمانێکی غەریب وەڵامیان دەدایەوە
گەرچی ئەوسا سروشت خەمهێن و ماتەمین بوو
کەچی.. بیرت بێتەوە.. هەتا لەسەر گووفەکی شاریش
کۆنە کیتڵی و بوتڵەکانیش
وەک چەند دانە گەوهەرێک دەدرەوشانەوە
هەروەک ئەوەی ئەوانیش..
خەون بە شتی جوان و ئازیزترەوە ببینن
ئەو هەورازەش کە گرتبوومانە بەر..

دەیڕوانیە خەرەندەکەی بەرامبەرمان

ئاخۆ ئێستاش ماچی ژێر ئەو ئاسمانە شینەت هەر بیرماوە..؟

ڕێکەوتی چ ڕۆژێک بوو.. نازانم

وەلێ لەو ڕۆژەوە تۆ بوویتە ڕوناهی و هەوای من

دەبا سالانی زووی پڕ بەزم بگەڕێنەوە

دەبا دیسانەوە لە گەرەکی -پۆمیگرانێت- بە یەکدی بگەینەوە

دەی من تامەزرۆی ژوانێکم

تەنیا من و خۆت لەسەر ئەم زەوییە

توخوا لێم گەڕێ با هەست بە گەرمی دڵت بکەم

کە بە یەکتریش گەیشتین

ئەوسا دەڕۆین ئازیزەکەم

تا هێزی بینینمان ماوە

تا هێزی بیستنمان ماوە

تا هێشتا هەناسەمان لەبەرماوە

منیش لەنێو کەف و کوڵی گرینمدا

هەر خۆم دەخیلتم و دەپاڕێمەوە..

هەتا زووە ژوانێ

وەرە ژوانم.. هەرچەندە کورتیش بێ هەر وەرە

وەرە نێو ڕەشەبای ئەو پایزە بەجێماوە

لەسەر شۆستەی ئێستگەیەکی زۆر جەنجاڵدا

هەر ئەوەتەو هێزی ئەم هەناسەیەم ماوە

دوا هاواری سەرە مەرگمە..

هیچ نەبێ لە دوا ساتما کە ڕادەکشێم

وەرە دیدەنیم.. بە خۆت و بەم چاوە شینانەوە..!

*

**ماریا پێترۆفیخ:** ژنە شاعیرێکی ڕووسییەو لە نزیك (یاروسلاڤل) لە دایك بووە. بە خوێندن (فیلۆلۆجی -زماناسی) تەواو کردووە. ماوەیەکی زۆریش خەریکی وەرگێڕان بووە. یەکەم کۆمەڵە شیعری لە ساڵی (١٩٢٦)دا کەوتە بەرچاوان. ئێستا لە مۆسکۆ نیشتەجێیە.

لە کتێبی The Tender Muse

## ڕووسیا

# "خەڵکی خۆیان لە تەنیایی دەشارنەوە"

یەلینا نیکۆلایڤسکایا

خەڵکی خۆیان لە تەنیایی دەشارنەوە:

هەن نامە بە دوای نامەدا.. دەنووسن

یەکێکی تر -هەر خۆی تەنیا- یاری بە کاغەزی قومار دەکا

یا هەر بەو هیوایەوە کتێبان دەخوێننەوە

یا بە دیقەوە لە وێنەکان ورد دەبنەوە

خەڵکی بۆ دەربازبوون لە تەنیایی..

گەرەکیانە لە کورتترین ڕێوە بۆ باوەشی یەکدی بچن..

دەبا لەوە سادەتر بین!

دەبا زیاتر هۆگری ماڵ بین!

یەکێک بە لە خێزانەکە!
دەبا هەر ڕۆژ تەلەفۆنێ بکەی
خەڵکی تەنها لە ترسی تەنیایی باوەڕیان بە یەکدی هەیە
(ئای لەو برسیەتی‌یە کوشندەیە کە ڕۆحمان دەخوا)
خەون.. هێما.. پێشبینین،
هەموو هێزە سیحراوی‌یەکان
بە ئاسانی- تەنها دەنگی مرۆڤێک پڕیان دەکا
زۆربەی هەر لە ترسی تەنیایی
خەڵکی بیر لە شتی گەورە دەکەنەوە
پەرستگاکان
گۆڕەپانی پاڵەوانان
باخچەی ئاژەڵان
هەر نیشان و.. هەر یاداشتێ
ڤیستیڤاڵ و کۆنگرێسەکان
ڕادیۆ
پوولی نامە
گشت تەلەفوون و شارەکان

ئەو پردانەی سەربەستانە زۆر دوور دەفڕن
هێڵی ئەو شەمەندەفەرانەی کە تا چاو بڕ دەکا..
دەڕۆن
وایەری ئەو تەلگرافانەی ئاسمانی کێشوەرەکان..
بە یەکدی دەبەستێتەوە
هێی تۆ لە کوێی..؟
ئاخۆ تۆ کێی..؟
خەڵکی لە وەڵامیانا دەڵێن:
چۆن بیر لەوە نەکەینەوە کە تەنیاین
بۆیە.. لەوەتەی ڕۆژانی نێو ئەشکەوتەوە
هەر لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ دێین و دەچین
تا ماوین هەر هەمان هەوڵ و تەقەللایە
وەکو -ئەتۆم- قەت کەرت نابین
لە یەکتری نابینەوە - یەکین.. چون یەک ئۆردی
سوپای سەرباز.. یەک دونیایی
ڕۆژێک دەژین
ئاشکرایە کە دەبێ زۆر بە توندی یەکدی بگرین

پاڵپشتی یەکتری بین

لەگەڵ یەکدی بە شەرەف بژین..!

★★★

**یەلینا نیکۆلایڤسکایا:** ژنە شاعیرێکی ڕووسە لە ساڵی (١٩٢٣)دا لە شاری (مۆسکۆ) لە دایک بووە. لە (١٩٤٦)دا پەیمانگای ئەدەبی گۆرکی تەواو کردووە. ئێستاش هەر لە مۆسکۆ نیشتەجێیە.

لە کتێبی- (The Tender Muse)

## ئەرمینیا

## "کە جێت هێشتم"

سیلڤا کاپوتکیان

تەواو.. جێت هێشتم..
گەرچی لە ناخەوە قەت باوەڕ ناکەم
بەدڵ یەکدی بەجێ بێڵین
من و تۆ.. هەردوو یەکێکین
بە کام ڕێگاشدا بڕۆیت.. هەر بە دواتەوەم
منم ئەوماڵەی تیا دەحەسێیتەوە
منم.. ئەو ڕێگەیەی لەبەر دەمتایە
گوزەر دەکەی.. لە خەیاڵتام
داگیرکراوی‌و.. من لە گیانتام
هیچم بۆ کەس جێ نەهێشتووە
چی چاوی جوان هەن بیانبینە

لە نیگاکانا هەر من دەبینی
ئازیزەکەم.. لە من زیاتر کێ شک دەبەی،
ئەوانی تر -داخ- کە هیچیان نابن بە من
ئەوەندەی دەنگ هەیە گوێی بۆ شل کە،
هەر دەنگە پڕ سۆزەکەی خۆم دەبیستی
لەوێ دیسانەوە.. لەتەک لقی درەختەکانا
پەنجەکانمان بەر یەکدی دەکەون
شەویش هەر چاوی منەو.. سەیرت دەکا
ئێوارانیش درەنگانێ..
کە بەرەو ماڵ دەبیتەوە
دیسانەوە بیرم دەکەی
دەبمە باریکە دووکەڵی جگەرەت
ئەستێرەی بەر ئاسمانی پەنجەرەکەت
منم لە دووری هەزاران میلەوە
دڵم بەر دڵت دەکەوێ
لە پەنجەرەوە ڕووەو ژوورەکەت.. شنەیەکم
گەر دایدەخەی - ڕەشەبام و دەیشکێنم

ئازیزەکەم.. ئەڤین هەر خۆی دڵێکی نەترسە
خۆم تێکەڵی دەفتەرەکانتم.. ژیانتم
هەموو دونیا لە کونجی ژوورەکەتا دەتەقێنمەوە
من کە تێکەڵی بوونتم..
لە بیرم کە.. گەر تۆ ئازای.. لە بیرم
کە..!

**

**سیلڤا کاپوتیکان:** کچە شاعیرێکی ئەرمەنی‌یەو لە ساڵی (١٩١٩)داو لە -یەریڤان- لە دایك بووە، سەرەتای بەرهەمەکانی لە ساڵی (١٩٣٣)ەوە بڵاوبۆتەوە. لە ساڵی (١٩٥١)دا لەسەر کتێبەکەی (ئازیزەکان) خەڵاتی میری پێ بەخشراوە.. ئێستاش دانیشتووی شاری یەریڤان-ە.

لە کتێبی
**The Tender Muse**
**Mosccow**
**(1976)**
لاپەڕە (٥٩)

## "بۆ پیاوێکی سەرەڕێ"

**مارگریتا ئالیگەر**

چەند حەز دەکەم لە تەکتا بم.. ئازیزت بم
بۆ تۆ.. لێرە.. من هێزت بم
شنەبایەکی فێنک..
نانی ڕۆژانەت،
ببم بەو ئاسمانە فڕیوەی وا بەسەر سەرتەوە
گەر ڕۆژێ هات لەو ڕێگەیە ڕایان ماڵیت
من ئەو ڕێچکەیەم بارەکەت بۆ دەگرمەوە
لەچی ڕامای.. بڕۆو بیبڕە
خۆ گەر تینوێتی بڕستی لێ بڕی
هەر خۆم کانی ئاسا بۆت دەتەقمەوە

نزیک بەرەوە.. بنوشتێوە.. بمخۆرەوە
گەر ویستیشت تا بەیانی بحەسێیتەوە
لەژێر تاریکایی قووڵ و پڕی شەوێکدا،
چی لە چیاکان یان دارستان
من هەر ئەو دووکەڵەم سەر ڕەشماڵت جێ ناهێڵێ،
چون گوڵی ئاگر بۆت دەسووتێم
هەر تەنیا بۆ ئەوەی تۆ بە دیم کەی.. ئازیزەکەم
چیت خۆش دەوێ لەم ژیانە-
بۆ بوونی هەر خۆم ئامادەم
بەیانیان زوو لەگەڵ شەفەقدا.. وەرە پشت پەنجەرەکەت
خۆت وەرەو لەم دونیا نوێیەدا پیرۆزم کە
منم تەنیا.. هەر خۆم تەنیا ڕێگەی شەڕێکم گرتۆتەبەر
چەکم تەنها چەپکە گیایەکی وشکە
دەبڕوانە چۆن بوومەتە گوڵە مێلاقە،
هەر بۆ ئەوەی بەزەییت بێ
سەیرکە چۆن بوومەتە باڵندەیەک
چۆلەکەیەکی شین و لە هەموو شوێنێ چریکەم دێ

لە بەهاری ڕۆژێکدا گۆرانی دەچڕم
نەبا بە دوامەوە ڕێ ون بکەی
دیسانەوە منم لە وەڵامی چریکەی بولبولێکا..
پەڕەکانم تۆپ و پڕ دەکرێنەوە
ئاونگی سەر گەڵای درەختەکان:
ئەویش هەر منم..!
منم..
تەمی سپی سەر ڕۆخانە
-ئەوە شادیت..؟
دەبێ وابێ.. خۆم لە تەکتام
خۆشەویستیم باڵی بەسەرتا کێشاوە
لەنێو هەزاران دا تۆم ناسی‌یەوە
لێم دابڕێی.. ئێمە ڕێبواری یەک ڕێگەین
ئەی پیاوە ئازیزەکەم.. تۆ تێم دەگەی؟
بۆ هەر کوێ بچیت.. ڕوو بە ڕووم دەبیتەوە
لەهەر کوێ بزرم کەی.. هەر لەوێ دەمدۆزیتەوە
ڕۆژێکیش دێ.. بە درێژایی ئەم ژیانە..

هەر تەنیا منت خۆش بوێ..!

**

**مارگرێتا ئالیگەر:** ژنە شاعیرێکی ڕووسـیەو لـە (١٩١٥)داو لـە ئۆدیسـا هاتۆتە دونیاوە، لە (١٩٣٣)دا چامە درێژەکەی بـە نـاوی -زۆیـا- بڵاوکرایـەوە. لە ساڵی (١٩٤٣)دا خەڵاتی میری وەرگرتووە.

The Tender Muse

**فەرەنسا**

## "زەنگی ماڵئاوایی"

**پۆل ئێلوار**

چی دیمان بۆ دەکرا..
که بەر دەرگاکان خرٍ گیرا بوون
چی دیمان بۆ دەکرا..
که هەموو دیل و بەند کرا بووین
چی دیمان بۆ دەکرا..
که شەقامەکانیش مۆر کرابوون
چی دیمان بۆ دەکرا..
که خەڵکی شار لە گەرمەی خەودا بوون..؟
چی دیمان بۆ دەکرا..
که ژنیش برسی و تینوو کرا
چی دیمان بۆ دەکرا..

که بێ پەناو بێ بەرگری جێیان هێشتین

چی دیمان بۆ دەکرا..

که شەوی تار هەموو ئاسمانی لێگرتین

چی دیمان بۆ دەکرا..

که ئێمە هەردوو دڵدار و دڵخواز بووین..؟

**

سەرچاوە:

The Penguin Book
Of Love Poetry
(1973)
Edited by John Stall

## ئیرلەندا

## "گۆرانی مەستی"

دەبلیو. بی. یەیتس

له دەمەوە..
مەی دەرژێتە نێو هەناو
خۆشەویستیش..
دەخورێتەوە بە هەردوو چاو
بۆ ڕاستی ئەم ژینە..
هەر ئەوەندە دەزانین
بەر لەوەی پیر بین و بمرین
هەر دەمێ..
بادە دەخەمە سەر لێوان و..
دەینۆشم

سەیری چاوانت دەکەم..

ئاخ هەڵدەکێشم..!

*

سەرچاوە:

The Penguin Book of Love Poetry

## ئیرلەندا

## "ڕۆمانس"

ئالن موور ئۆپیا

(١)

وەک "با" مۆسیقای بەهار
لە ولاّتێکی ترەوە.. دێ
دەلوێ کەسێک ئاسمان کون کاو..
گەنجینەی زێڕی دەست کەوێ
**
لەوە دەچێ بیری بێ بن بێ..
سەرچاوەی ئەم ئێوارە بەهارییە
ڕوو ئەرخەوانی..
هەورە تریشقەی زستانی دێتەوە یاد
وەک هەر ئەستێرەیەکی مۆنیش خەون دەبینێ

**

هەردوو ماتین.. پڕ لە نهێنی.. لە ناخیشما..

لە شوێنێکا یاری بە ژێی ڕۆحم دەکرێ

بە زەبری "با"ش مۆسیقای بەهار

لە ولاتێکی دیکەوە.. دێ

*

(٢)

دێتەوە یادت.. ئەو ڕۆژەی شارێکمان دۆزییەوە

بارانی کردبوو بە چەتری سەری..؟

تەڕ بووین.. عەودالی قسە.. هەر دەڕۆیشتین

شەیدای گۆمە هەرە پیسەکانیش بووین

**

ئەوسا.. مانگیش دوور بە حەواوە

بەسەر دیوارە ڕەشەکانی شارەوە

تۆ بڵێی ڕێگەمان هەڵە کردبێ..؟

کەچی نەشگەڕاینەوە دواوە.

**

دەشێ ئەم عیشقەمان باران.. یا تەم بووبێ
دەشێ گۆماوەکانیش، بێ هۆ، هەبن
وەلێ ئەم تکە ئاوانە.. من دڵنیام
لە ناخما تێکەڵ بە شتێکی منن

*

(٣)

سەیرکە.. بەفر چۆن سەرئاو دەکەوێ
لەو شوێنەی دوێ شەو پیاسەمان دەکرد
گوڵ خونچەی ناسکی بەر بەیانیش
چاو دەکاتەوەو پرشنگ دەپژێنێ

**

سەیری پرشنگی قرمزی
کە بەفر دەکا بە خوێناو
سەیری کەناری شۆڕاویش
دەبریسکێتەوە وەک مسی زەردباو

**

بەفری تواوە سەر دەکاو دەخزێ

تێکەڵ بە ئاوی جۆگە دەبێ

چەشنی بەفرە ئەو حەزەی من

لە ڕاستی ناچێ.. هەر دەڵێی خەونە

*

(٤)

سوور پۆش بوویت کە منت جێهێشت

خۆر بوویت و نواڵەش شەپۆلی دەدا

ئەمێستاش لەنێو کاسەی سەرما

گوێم لە ترپەی پێتە.. کە نەدەما

**

لەوانەیە هەر لە جادەکەی ئەوبەر بیت

یا تا ناوقەد غەرقی گوڵ بیت

چی چاوەڕێ دەکەی.. چۆن بژیم

چ خامۆشی‌یەکە کە دووریت هێنای..؟

**

لەنێو کاسەی سەری بەتاڵما هەنگاو هەڵدەنێی

هەروا دێو.. ترپەکانی بەرز دەبنەوە

ئەی ئەو کچەی..

لەنێو ڕەنگی گوڵ خاشخاش دا دەدرەوشێیتەوە

تۆ بۆ تا ئەبەد..

لەنێو شەپۆلی نواڵەو پرشنگی خۆردا دەسووڕێیتەوە..؟

*

(٥)

تەنیا بووین لەژێر هەمان ئەستێرەی کەمدا

لەژێر هەمان بەتانیەی بۆرو سەدان کون تێدا

لە هەموو شوێنێ و لەتەک خەڵکێکی زۆردا

بۆ نان و پارە هاوارمان دەکرد.. تا قوڕگمان دڕا

**

بە تەنیا بووین.. ئەو هاوارەمان بیست

بە تەنیا بووین.. جیهانێکی جیامان دیت

وەلێ هەر بە دوو ڕوویی ماینەوە

واشمان زانی.. ئەوانیش هەر وان

**

چەندەها جار شتم بۆ پێچایەوە

بیرم لە نامەی ئایندەی دەکردەوە

بە نامە بۆن خۆشەکەی دڵ دەکرایەوە

تۆش چاوەڕێ بووی..

گوێت هەڵدەخست شێتم دەکردی

بۆ ئەو قسە بێ سەرو بەرانەم کە دەمردی

**

هەتا دڵی چکۆلانەی نەورەسێکیش

دوور لە تاشەبەردی بە شەپۆل شۆراو

بە سۆزێکەوە.. بۆ نەورەسی تەک هێلانەکەی..

دەچریکێنێو..

دەچریکێنێ و ئەو ناوە دەنگ دەداتەوە

*

(٦)

ڕۆژێکی دیکەی پاییزیش دەمرێ

گەڵایەکی زەردی تریش، بێ هوودە، هەڵدەوەرێ

پرشنگ پاک و هەواش خۆش

کەچی هەموو شتێ بۆنێکی کۆنی لێ دێ

**

لەو شوێنەی بە ڕووی من دا

وەک گیای دەوری کێلێکی شکاو

هەناسەی زیندەگانیت دا

هەر ڕۆژێ کە تێدەپەڕێ

ئەم دونیایە پیرتر دەبێ

هەر ساڵێکیش کە تێدەپەڕێ

گەڵایەکی زەردیش هەڵدەوەرێ

کەچی ئێمەش بەو یادە دەژین

یا حەز دەکەین وا بیر بکەینەوە

کە پایز هەرگیز مات و زیز نەبووە

ئەو کاتەی عومری لاویمان.. بەسەر بردووە

**

(٧)

کاسەی سەرم کڵێسایەکی تاریکە

وشە زەلیلەکانیش ئارامگای جەستەم

لە چاوەڕوانی نازدارێکا

هەناسەی مۆمێک هەڵدەمژم

لەژێر سێبەری ئەستوونێکا

گوێم لە جیڕەی دەرگایەکە

وەلێ ئەوە شۆخەکەی من نییە

بەڵکو تەنها پەیکەرێکە

پەیکەری ئەو خانمەی منی بە خەمەوە کوشت

**

من ئافرەتم دەویست.. نەک وێنەکەی

کە بۆ من ژنێکی بە وەفا بێ

وەلێ لە تاقەکانی ئاسمانەوە

فریشتەکان بە ژیانی تاڵم پێدەکەنین

**

ئەوینی خامۆش هەروەکو مۆمێک

ئارەزوومە هەموو ئاوی ڕووت بتکێ

بتکێ و ببێ بە دڵۆپە ئەسرینێک

ئەسرینی خامۆشی..

که بۆ تەنها وشەیەک داتکا بێت

وا بزانم لێرە بوو کە تۆم ئاشنا بوویت

**

نە گۆڕ، نە کێل، نە چیمەن.. نەمان و لە یاد چوونەوە

نە وشە، نە چرپە.. نە دونیای خامۆش

هەر هەمووی ڕەفتەن.. کوێر بوونەوە

کەچی تازە خونچەی حەزێک لە ناخی مندا دەم دەکاتەوە

جۆگەلەی خوێناویشم، بەم بەهارە، هەزاران خونچە..

ڕادەداتەوە

**

گۆڕەکان جێمان.. لەو شوێنەی وەک "با" هەناسەم دا

هەناسەی چی.. شیعری عاشقانەی هەرزەکارێک ئاسا.

**

**ئۆپیا:** دەنگێکی تازەی شیعری ئیرلەندییەو لە دایك بووی (دەبلن)ەو تەمەنیشی بیست و هەشت ساڵە، دەرچووی بەشی ئینگلیزی و فەلسەفەیە.. ئەمێستا لە -دەبلن- فەرمانبەرێکی باج وەرگرە.

سەرچاوە: (بریتانیا/ ١٩٨٦) Alan Moore Poems- Poetry Book Society Choice.

## ئوستراليا

### بەرلەوەی

**ماكس دەن**

بەرلەوەی قاچم هەبووبێت.. من سەمای خۆمم كردووە
بەر لە بوونی زمانیشم.. من گۆرانی خۆمم وتووە
پێشكەنیوم.. گەرچی چاوانیشم نەپشكوتوون
بەر لە بوونی دڵێكی تەڕ.. تامی عیشقم زۆر چەشتووە
**

دەستم نەبووە.. مەلەی خۆمم هەر كردووە
بەر لەوەی گوێم لە جریوەی ئەستێرەش بێت
یا بوونی شێتانەی گوڵێكم زانیبێت
لە پەنجەی پێم دووری ڕێگەم هەڵگرتووە
**

پێش ئەوەی بەم ڕۆژەش بگەم

بەروبوومی زۆری دونیام تام کردووە

بەر لەوەی لە گۆڕیشم نێن.. من زانیومە

مردن چی بۆ خۆی بردبێت.. کرم هەر ئەوەی خواردووە..!

*

**هیند**

## "میوان"

ئەسرارول هەق مەجاز

تەنها ئەمشەوم لێرە ماوە
بەیانی دەڕۆم و سەرهەڵدەگرم
ژیانیش دەعبا ئاسا
دەمی بۆم کردۆتەوە
چاوەڕێیە.. چاوەڕێی منی نێچیر
ئەم ژینە ئاودامان..
خەڵتانی خۆڵ و خوێنە
گڕ لە چاوانی دەبارێ
دەبا بۆ ساتەوەختێ
خۆمان لە بیرکەین و.. شادبین
تەنها هەر ئەمشەو لێرە دەبین..!

*

ئەوەندە ناباو.. گڕەیەک هەڵئەکا
ڕۆحی دارمین دێتە سەما
دڵی ئەم زەوییەش دەلەرزێ
کە لەشکری وەحشییەت..
بەسەریا ڕادەبووڕێ
دەبا تاسەو حەزی خنکاومان
بتەقنەوەو.. بکەونە بەرچاوان..

*

ئەم پێکە لێوان لێوەو.. لێی دەڕژێ
ئەم گفت و گۆیە چەند خۆشە
ئای لە گەرمی ئەم باوەشە
وەی لەو ماچانەی گڕیان لێ دەپژێ
ئەوەن گڕاوین
گڕ لە خەرمانی هەستم بەردەدەن
من ڕۆحم سارد.. بەستوویەتی
وەرە با بە جووتە گەرمی کەینەوە..!

*

چەند پێکێکی دیکەو..

ئیتر زیندوو دەبمەوە

ئەوسا لە تەلی مۆسیقای ژین ئەدەم

زبانی ڕەوانیش.. گرێدەکاتەوە

دە لێم گەڕێ.. با زیت و زیرەکتر بم..!

*

کەی شەوێکی دیکەی ئاوامان.. بۆ دەرەخسێ..؟

ساتانی پڕ خۆشنوودی

ئەوپەڕی کپی و خامۆشی

ئەمشەو هەتووانە..

هەتووانە بۆ تاسەو ئارەزوو

ئارەزووی شاراوەو مردوو

هەتووانە بۆ سۆز.. سۆزی هەڵچوو

سۆزی شێتانەو گڕگرتوو

کەواتە وەرە ئەمشەو

با شەوێکی نەمری عومر بێ

هەر ئەمشەو لێرەین..

با شەوێکی عومری ئەبەد بێ..!

**

لە کتێبی Modern Indian Poetry Edited by Pritish Nandy لاپەڕە (٥٤)

**هیند**

## "فەرمان"

عەلی سەردار جافری

بۆنی کە..
بۆنی خوێن و باroوت کەو..
وا بزانە خۆشترین بۆنە
فەرمانەو دەرچووە
وا بزانە ئەم برینانەش
دەمی کراوەی خونچە گوڵن
دە لەزەت کە..
مەرگ لە باوەش بگرەو.. لەزەتی لێ بکە
وا بزانە کەوانەی ئەم شمشێرەش
شێوەی شیرینی دولبەرەکەتە
ناو لە شەڕ بنێ ئاشتی

دەبا ئاشتیش شەڕی ناوبێ

جێ برینی ئەو دڕکانەش..

بە گوڵ تێ بگە

زۆرە.. یەکجار زۆرە..

لە هەموو شوێنێک دا..

چاوانی پڕ فرمێسک گەلێ زۆرن

دەوا بزانە

ئەم جامە پڕ فرمێسکەی دەستیشت

پێکێک شەرابە

ڕۆحی شەیتان بە جبرییل بەخشە

دەوا بزانە..

ئەم درۆیانەش فەرمایشتی خوداوەند

یا گفتەکانی پێغەمبەرە..

دە وای تێفکرە..!

**

## یۆنان

## "چراو.. ئەوینی شەو"

میلیگەر

ئەوینی شەو.. لەگەڵ چرا
گەواهی پەیمان و بەڵێن بوون:
کە تا مردن خۆشی بوێم
منیش هەرگیز جێی نەهێڵم
ئەوینی شەو.. ئەتۆو.. چرا
گەواهی ئەم بەڵێنەتان دا
**
کەچی ئیمڕۆ.. سوێندو پەیمان
نەماو ڕمان
"سوێندی ئاوا.. دیارە بڵقی سەرچاوە"
دەتۆ ئەمشەو..

گەواهی بە ئەی چرا

کە ئەمشەو ئەو..

ئەوەتانێ لە باوەشێکی ترا..

**

لە کتێبی The Penguin Book of Love Poetry

**غينيا**

## "لێیان بەدوور بە"

جۆزیف کاریۆکی

خۆشەویستەکەم..
بەس بە شەقامەکان دا بگەڕێ و.. وەرەوە
چەندەها چاو.. بێ بەزەییانە..
لەو لەش و لارە ڕەشەت.. ورد دەبنەوە
لێیان دوورکەوە
جامخانەی کۆگاکانیش..
جیاوازی نێوان ئێمەو ئەوان..
دەکا بە نیشان..!
ژووره هێمنەکەم چاوەڕێتە.. وەرەوە

ئارامگاتەو تیا بسرەوە

لێرە لە هەموو تیرو توانجێک بە دووری

خۆت لە پشت من بشارەوە

ئەوسا هەر تەنها خۆم دەتبینم

لە چاوە ڕەشەکانیشما

ڕەنگی ئەو پێستە ڕەشەت.. دەتوێتەوە

**

تیشکی مۆمێکیش..

سێبەری هەردووکمان

بەسەر دیوارەکەوە دەخاتە سەما

سێبەرەکان تێکەڵ دەبن.

ئەوکاتەی لێت نزیک دەبمەوە

دواجاریش.. کە چراکان دەکوژێنەوە

هەست دەکەم دەستت لەنێو دەستمایە

هەناسەشمان تێکەڵ دەبێ

سازی پیانۆش دادەڕژێ

چ ئاوازێک دەچنێ

به چەشنه خرۆش و ئیقاعێ

که کەس بۆی ناکرێ

گوێی لێ نەگرێ..!

**

له کتێبی

Modern Poetry from Africa.
Edited by Gerala Moore & Ulli Beier

چاپکراوی (بریتانیا- ١٩٧٩)

## ئەنگۆلا

### "ماڵئاوایی ساتانی لێك دابڕان"

ئەگۆستینۆ نیتۆ

دایە گیان..

"ئۆە.. ئەی ئەو دایکە پێست ڕەشانەی..

ڕۆڵەکانتان جێیان هێشتوون"

هۆ دایکە گیان.. تۆ بوویت..

فێری هیواو چاوەڕوانیت کردم

لە ساتانی کارەسات و کۆست کەوتنا

هەمیشە هەروا بوویت و.. هەروات فێر کردووم

وەلێ لە ناخما

ژیان ئەم ئومێدە پڕ نهێنی‌یەی کوشت

چیتر چاوەڕێ ناکەم..
لەمەودوا.. دەبێ ئەوان چاوەڕێم کەن
لەمەودوا ئێمە هەر خۆمان
گشت هیواو.. ئومێدێکین
مناڵە دەربەدەرەکانی تۆ..
ڕووەو ئەو بڕوایە دەڕۆن
ئەو بڕوایەی دەبێ بە خۆراکی ژیان
ئێمەین.. مناڵە ڕووت و ڕەجاڵەکان
بێچووەکانی نێو دارستان..!
ئەو منالآنەی هەرگیز قوتابخانەیان نەدیوە
ئەوانەی لەبری تۆپ
لەژێر گەرمەسێری هەتاوی نیوەڕۆدا
لە دەشت و زورگەکان دا
یاریيان بە تۆپەڵە پەڕۆی کۆن دەکرد
ئێمەی بەکرێ گیراو..
بە کرێ گیراو تا لە کێڵگەی قاوەدا
ژیان و تەمەنی خۆمان بسووتێنین..!

ئێمەی ڕەش و هیچ نەزان
که دەبێ هەمیشه..
ڕێزی سپی پێستەکان بگرین
هەمیشه لە دەوڵەمەندەکان بترسین
ئێمەین.. ڕۆڵەکانی تۆ
دانیشتووانی گەڕەکی -شارەوانی-
ئەو گەڕەکانەی کە هەرگیز کارەبایان بۆ ناچێ
ئێمەین..
ئەو پیاوانەی هەر بە مەستی دەمرین
ئێمەین کە بە ئیقاعی مەرگ ڕاهاتووین
هەر بەو ئیقاعەوە لە پەل و پۆ کەوتووین
ئێمەین ڕۆڵە برسی‌یەکانی تۆ
هەمیشه تینوو..
ئەوانەی پیٚیان شەرمە بڵێن: دایە..!
ناشوێرن بە شەقامەکان دا تێپەڕن
ئەوانەی لە مرۆڤ دەترسن
بەڵام ئێمەشین..

هیوای ئەو ژیانەی..

کە هەر دەبێ: بگەڕێتەوە..!

**

نیتۆ: لە ساڵی (١٩٢٢)دا لە (ئیکۆلا ئێ بێنگۆ)ی -ئەنگۆلا- لە دایك بووە. لە - لیشبۆنە- بەڵگەنامەی لێزانی سەبارەت بە نەخۆشی و دەرمان وەرگرتو گەڕایەوە ئەنگۆلاو کەوتە خزمەتکردن. بە سەرۆکایەتی (ڤێریاتۆ دا کروز) چووە نێو بزوتنەوەیەك کە پەیوەندی بە زیندووکردنەوەو دۆزینەوەی کەلتووری میللیەوە هەبوو -کەلتووری ئەنگۆلا- لە ساڵی (١٩٦٠)دا کرا بە سەرۆکی -بزوتنەوەی ئازادی ئەنگۆلا (M. P. L. A) هەر لە هەمان ساڵدا گرتیان و بە بەندکراوی ناردیانە -پورتوگال- بەڵام لە ساڵی (١٩٦٢)دا وا بڵاوبوّوە کە بە یارمەتی -بزوتنەوەی بەرگری دیموکراتیەکان- لە -پورتوگال-ەوە ڕایکردووە. ئەم شاعیرە بە پورتوگالی و ئەنگۆلی شیعری بڵاوکردۆتەوە.

لە کتێبی

Modern Poetry from Africa
Edited by Gerala Moore and Ulli Beier

(بریتانیا- ١٩٧٩)

لاپەڕە (١٩٧)

## "چەکمەجە"

جۆرج ماکبێث

شتەکانی هەردووکیان تێکەڵ بە یەکدی
وان دەنێو چەکمەجەیەکی ئەو مێزە.. بە پەرتی
لەوێدا بوون: جانتای دەستی دایکە..
جانتای قایش تیمساحی
هەر هەموو نامەکانی.. دەرزیلەو سنجاقی
هەموو ئەو شمەکانەی لەتەک دۆلابەکە ڕیزی دەکردن
لەگەڵ گۆزەیەکی چکۆلەو کەسک..
کە کردبووی بە ئینجانەی گوڵەکانی
**
شتەکانی باوکەش دەنێو زەرفێکدا بوون:
پەتێکی خاکی بۆ مەدالیای مل، دەستەسرێکی گەچلاو

دوانزە جگەرە.. قەڵەمی قۆپییە

هەموو ئەو شتانەی کە پێی بوو وەختێ کوژرا

یان هەموو ئەوانەی دایکە ویستبووی تەقەتیان کا.

**

من خۆم تێکەڵم کردن.. حەوت ساڵ بەر لەمڕۆ

هەنووکەش وا گواستمانەوە.. خۆم و ژنەکەم.

بۆماڵێک کە ماڵی مەیە..

ئەوەتا هەر هەموویم دەرهانی

تا ئەو حەڵەی چەکمەجەیەکی بەتاڵمان دەبێ

هەمووی وا لە کارتۆنێکی مقەباو..

لە هۆڵەکە فڕێ دەدرێ.

**

دە گەر وابێ.. ئەو مردووە..

ئەو پیاوە عومر ناوەڕاستە.. چین ناوەڕاست

کە بە هەڵە ساچمەی گوللە تۆپێک کوشتی

ژنەکەیشی داڕزانی جەرگ بردی

هەردوو کوڕێکی تەنیایان جێهێشت.. تەمەن نۆ ساڵ..

نۆزدە.. بیست و شەش ساڵ

کە ئەوەتانێ هەردووکیانی دەنێو کارتۆنێکی..

مقەبادا ناشتووە

*

## پەراوێز:

★جۆرج ماکبیێث: لە سکۆتلاند لە دایک بووە و لە ئینگلتەرە خوێندوویەتی و هەنووکەش لە ئیرلەندا دەژی. ئەم شاعیرە نۆ ڕۆمانی نووسیوە جگە لە بلاوکردنەوەی حەڤدە کۆمەڵە شیعر و حەوت کتێبی هەڵبژاردەی ئەدەبی. بۆ چەندین ساڵ لە ڕادیۆی (BBC) دەرهێنەر بووە، هەنووکە نووسەرێکی سەربەخۆیەو لە هەمان کاتدا بە سەربەستی خۆی مامۆستا بووە و هەم بۆ ڕادیۆش ئیشی کردووە، لە زۆر ولاتی دونیادا شیعری خوێندۆتەوەو لەگەڵ مۆسیقاژەنەکان و هونەرمەندەکان هاوکاری هەبووە. یەکەم کۆمەڵە شیعری سی ساڵ لەمەوبەر بلاوکردۆتەوە. لە شیعری هاوچەرخدا مەقامی خۆی هەیەو بەوە ناسراوە کە ئەزموونە تازەکانی لەڕێی تەکنیکی تەقلیدییەوە دەردەبڕێ، بە ڕای ڕەخنەگران یەکێکە لە شاعیرە هەرە داهێنەرەکان.

سەرچاوە: George Macbeth Collected Poems- 1958- 1982

London لاپەڕە (١٥)

## "داهۆڵ"

کارۆل موسکە

وێ دەچێ خەونەکانت شتێکی تێچووبێ
قەڵەڕەشەکان شوێن پێیان هەڵگرتیت
تا بزانن تۆ چۆن شەوەکانت بەسەر دەبردن
هاوینی پار
هەنووکەش ئەوەتان لێرە تا خەبەردارمان کەن لە تۆ

*

بە ڕووخسەتی خۆت ئەوان بۆ تۆ
ڕابردوویەک دەسازێنن
دەست و پێی پێ دەبەخشن
دەنگێک
تا هەموو شتێکمان بۆ وەگێڕێ

*

ئەرێ تۆ لە نزیکەوە گوێت لێیە؟

ئاخۆ بۆ هەنووکە هیچت پێیە بیڵێی؟

ئێمە کۆنە پەڕۆی هەلاهەلای دۆشەگەکەی تۆمان لە کنە

لامانە تەختەودار

یاڵ و بژی ئەسپەدارینەی کوڕەکەت

*

لامانە مۆم و سەعاتی زێڕینی ژنێک

گوێت لێیە چاک؟

بەڵگەمان لایە دژی تۆ

لامانە پەلکە پرتەقاڵەکان

ئەو وێنانەی لە کەنار دەریا گیراون

ئەو ڕەسمانەی دەنێو پێخەفی نووستنا گیراون

*

جوان گوێ هەڵخە

لامانە تکیتە ونبووەکانی شانۆ

ئێمە تۆ تاوانبار دەکەین

به سەعاتی زێڕینی ژنەکە
ئەسپە دارینەی کوڕەکەت
پەلکە پرتەقاڵەکان گەواهین
لەگەڵ گشت وێنەی مۆمەکان
*
بێبەزەیییە ئەم دادگایە
قەڵەڕەشەکان خۆشیان لێ دێ
هەر هەموو بەڵگەکان بگوێزنەوە
چاوەڕێی بەزەیی مەبە
قەلەڕەشەکان تکیتەکانی شانۆمان بۆ دەهێننەوە
*
دە ئێستا گوێ بگرە
ئێمە (هەنووکەیەکت) بۆ دەخوڵقێنین
***

## "کانیاوە گەرمەکان"

کارۆڵ موسکە

دە باشە.. کچە واهی ژنەوت
ئاوی نێو بەلووعەکان کە ڕەگیان
دەچنەوە ژێر ئاگردانە کۆنینەکان
لە دەمێکی بەردینەوە دەڕژێتە دەرێ
ڕەشەبایەکی سوور کە لێرەوە جارێ..
لە جاران هات و تێپەڕی
دڵی خۆی لەژێر بەردێکدا بەجێ هێشت

*

وا لەو خوارە پایزە
گەرمی لە لافاو
هەر زەندەی دەستێک قامیشێکەو پڕ

وا بەو قەدپاڵە لێژەوە

*

من دوو جاران لەنێو پاکی خۆمدا نوقم بووم
کەوتمە بنی مەنجەڵەکەوە
پێستی لەشم هەلا هەلاو
مەلەم دەکرد کچە گوتی
چ ئاسانە

## پەراوێز:

کارۆل موسکە شیعری خۆی وا دادەنێ کە بتوانێ خۆ بپارێزێ: ئەویش بە ڕەنگ گۆڕین وەك ئەو زیندەوەرانەی بە پێی ڕەنگی شوێنەکان ڕەنگ دەگۆڕن، لای ئەم خاتوونە هوشیاری و ویست و هەڵبژاردنێك هەیە کە پەیوەندی بە هەست و نەستی خۆیەوە هەیە، ڕوانینی بۆ شیعر، بەلاّم "دەنگەکانی" پڕ لە نهێنی و تەم و مژو نادیارن، هەندێ جاریش خۆڕسکانە خۆ دەخاتە بەردەستی شیعر بێئەوەی لەوە بترسێ بۆ کوێی دەبات.

لای ئەم شیعر ئەو بەرگەیە کە نیازەکان لەخۆ بگرێ، ئامرازێکە بۆ مانەوە، بەپێی ویستی شاعیر و خودی شیعر خۆ دەگۆڕێ، کاژی کۆن فڕێ دەداو کاژی تازە دەپۆشێ، هەمیشە لە نوێ بوونەوەدایە.

خاتوو کارۆل لە شاری "نیویۆرك" دەژی، لە قوتابخانەیەك کە تایبەتە بە شیعر و شاعیران مامۆستایە، سەرپەرشتیاری مەڵبەندێکە کە ژنانی زیندانی فێری نووسین دەکا، مەڵبەندەکەش ناوی لەخۆ ناوە "فەزای سەربەست" ئەزموونی ئەم خاتوونە لە شیعری ئەمریکیدا زۆر تازەیەو من بۆ خۆم کۆمەڵێ شیعریم کردووە بە کوردی تەنها بۆ ئەوەی شاعیرەکان و خوێنەری کورد ئاگای لەم جۆرە ئەزموونانە هەبێ با لەگەڵ زەوقی وەرگێڕیش یەکدی نەگرنەوە.

سەرچاوە/ زانکۆی پتسبێرگ ١٩٧٥ Camou flage Carol muska

## "لەوبەر"

چاندرا سیغار پاتل

لێرە.. لە تەکما ڕاکشاوە
هاوتەریب لەپاڵ جەستەی من
کەسێکی دیکەیەو.. وا دەگری
هی خۆتە: لە باوەشێی کە.. دەجوانی کە
ڕووی تێ دەکەم..
کە دەیگەمێ هەڵدەپرِوکێم
تاوێک و.. سارد دەبمەوەو دادەمرکێم
ئاگر بە ئاگر دەکوژێتەوە
*
پاشی.. خەوێکی خۆش و گران
لە خۆیم وەردەپێچێ

خەواڵوو بوونی ڕۆژیش
دەرژێتە نێو ڕەحمی شەوگار
ترپەی دڵ و دەمارەکانیش خاو دەبنەوە
جەستەش لەژێر سووتانێکی سارد-دا
دەگەشێتەوەو گوڵ دەردەکا
تەنها شتێ کە لە دەستم بێ..
ورتە ورتێکی نێو خەونەکانمە

*

وەلێ تۆ کێی
کە لەودیوی خەونەکانمەوە پێدەکەنیت..؟
تۆ بڵێی ئەو کەسە بیت کە خۆشم ویستیت
ئەو شۆخەی کە گیرۆدەم بوویت..؟

**سەرچاوە** The Indian Modern Poetry لاپەڕە (٦٧)

## "ونبوون"

دەبلیو. ئێم. لێتس

که تۆم لێ ڕۆی.. خۆرو مانگیشم لێ بزر بوون
هەموو ئەو ئەستێرانەش شەوانی غەریبیی منیان
ڕۆشن دەکرد
له کیسم چوو: ئومێدی بەهار.. کەیف و سەفای
سەروەختی جۆخینان
خامۆشی خەزان.. ئاگردانێ له زستان
سیحری ژین.. ساتانی وا شیرین
که دەمزانی هەر تۆزێکی تره گوێم له ترپەی هەنگاوته
خەندەی نەکوژاوەی سەرلێوانت.. ماچەکانت
هەر هەمووی بە هەدەر.. له کیس من چوون
بۆ خامۆشییەکی ئاواهی سارد..

ڕۆژانی بێتلانەوەو.. بێ خۆشنوودی
هەموو هیواو ترس و دڵەڕاوکێیەک.. هەموویم دۆڕاند
لە من گوم بوون.. زەرکەفتی پەلکەزێڕینەکان
کلیلی زیوین.. بۆ دەروازەی شاری خەونەکانم..
سەربەستی بەخشین
ئیتر ڕێم ون کردو.. نەچوومەوە سەر ئەو ڕێیەی
دەیبردمەوە نێو وڵاتێکی سیحراوی
سەرخاکێک: تا چاو بڕکا درەختی نارەوەن و بناو.. بێ
لە گوێ چەمەکانیش شینە شاهۆی خەمخۆرە بێت و بچێ
ئازیزەکەم لە دەستم دا سەنعەتسازی شیعرەکانم
ئیتر بزر بووم دەنێو توونی بابای زیندەگانی
ئەو وەختەی کە تۆم لە دەست دا..
من چ بزربوونێ بزر بووم..!

سەرچاوە: HALLOW- E' EN AND POEMS OF THE WAR W.M. LETTS
لاپەڕە (٣٨)

## "دیدەنی‌یەکی سەیر"

ولفرید ئۆون

پێ دەچوو لەتاو شەڕێکی کوشندە هەڵەتە بووبم و..
خۆم هاوێشتبێتە قووڵایی چ توونێلێکی تاریکەوە
تونێلێک لە بەردی گرانێت
دەستکردی شەڕە کۆن و زۆر کوشندەکان
کەچی ئا لەوێدا کەسانێک ماندوو لاڵ و پاڵ کەوتبوون..
دەیاننرکان
زۆر قووڵ غەرقی تێفکرین.. لە مەرگ ڕادەمان
پاش تاوێ کە دەستم کوتا یەکێ لەوان ڕاجفری
بە دوو چاوی زەق و.. پڕ لە زەبوونی تێم ڕاما
وەک کەسێ بپاڕێتەوە هەردوو دەستی ماندووی هەڵبڕی
خەندەی سەرلێوانی لەو ڕاڕەوی مەرگە حاڵی کردم

هەر بەو خەندە مردووەوە تێگەیشتم..

کە هەردوو واین لە چ دۆزەخێکدا

ئەو ڕووخسارە بە دەم هەزاران ئازارەوە دەیدواندم

گەرچی خوێنی سەرخاک نەڕژابۆوە نێو ئەو کۆندرە

نە تەقەی تفەنگ و.. نە نرکەی نێو ئەو کەندولەندە

وتم-"هاوڕێی نەناس.. لێرە چ پێویست بە ناڵەو هاوار ناکا"

هاتە وەڵام - "هەرگیز.. دەبێ جگە لە عومری بەهەدەرچوو..

چیمان هەبێ..؟

جگە لە بێهوودەیی و.. نائومێدی.. چ دڵێکت بە دونیا خۆشە

خۆ منیش هەروا ژیام.. شێتانەش کەوتمە ڕاوکردنی

کێوی ترین جوانی نێو ئەم دونیایە

ئەو جوانی‌یەی لە چاوان ئارام ناگرێ.. یا لە قژی پەخش و بڵاو

بەڵکو بە مەزاقەوە لە غاری هەمیشەی زەمەن دەڕوانێ

کە خەمیش دایدەگرێ.. قووڵترە لەو خەمەی وا لێروکانە

خۆش مەشرەفی منیش زۆر پیاوی خستۆتە قاقاو خەنین
لە گریەو ناڵەشم "شتێ" جێ دەما
شتێ کە گەرەکە هەنووکە بمرێ.. مەبەستم حەقیقەتێکە پەنهان
بەزەیی نێو شەڕوشۆڕ.. ئەو بەزەیییەی تنۆک تنۆک..
جەنگ دایچۆڕان
ئەوەتا پیاوانیش هەنووکە ڕازین بەو دونیایەی ئێمە پیسمان کرد
یاوەتە قەڵس و بێزارن.. خوێنیان دەکوڵێ و.. بێ هوودە دەڕژێ
چەشنی پڵنگ چوست و لەسەر پێن
کەسیش زات ناکا لەو ڕیزە دەرچێ.. گەرچی میللەتان وان لە پاشەکشێ
گەلێ بوێر و بە جەرگ بووم.. زاتێکی پڕ لەغزو پەنهان
ئەوەن هۆشمەندو.. کارامەو وەستا بووم
کە ڕێ نەکەم لەگەڵ دونیایەک لە پاشی دایە
پاشەکشێ ڕووەو قەلا دارماوو.. بێ شوورەکان

ئەوساش کە خوێنێکی زۆر مەیی.. پێچکەی گالێسکەکان تیا
ختم و عاسێ ما
سەرکەوتم تا بە ئاوی سازگاری بیرەکان بیانشۆمەوە
لەتەک ئەو حەقیقەتانەی کە دوور لە پیسی و
قووڵ جێگیرن
بێ دەربەست.. سەربەستانە ڕۆحی خۆم هەڵدەڕشت
نە بە دەم برینەوە.. نە وەک باجی جەنگ
تەوێڵی پیاوانیش بێ برین خوێنیان لێ دەتکا
هاوڕێکەم.. من ئەو دوژمنە بووم کە تۆ کوشتت
لەنێو ئەم تاریکی‌یە تۆم ناسی‌یەوە.. چون تۆ بووی کە دوێنێ
ڕووی خۆت لێ گرژ کردم.. لەوکاتەی بکوژو ببڕ..
دەستت دەوەشاند
من خۆم پەنا داو.. وەلێ هەردوو دەستی من ساردوسڕ..
بێ توانست
دەی برادەر.. با ئێستاش هەردوو پاڵ کەوین..
بۆ تاوێ بسرەوین..

★★★

١-سەرچاوە:

The Penguin Book of
English Verse
Edited by John Hayward

لاپەڕە (٤٢١-٤٢٢)

٢ -ئۆون: شاعیری جەنگی جیهانی یەکەمەو لە (١٨٩٣) لە دایـك بـووەو لـە چواری گـەلاڕێزانی (١٩١٨) کـوژراوە.. یەکێکـە لـەو شـاعیرە ئینگلیزانـەی بـە نەغمەیەکی تراژیدی لە جەنگ دەدوێ.

# "دوا هۆنراوە"

".. هەموو ئەو شتانەی خەونمان پێوە دەدی.."

لاریسا ڤاسیلیڤا

بە هەق.. لەوێدا ڕۆحێک نەبوو کە من چاوەڕێی بکەم
گوڵەکانی لەیلاقیش دەنێو گرِدا هەڵدەپرِوزێن
لە دووڕیانی سێبەرو هەتاودا..
من سەرمەند و ئارام ژیام
**
چ سانا بوو من ڕابردوو جێ بهێڵم
لە دووڕیانی سێبەرو هەتاودا
وەلێ من قەت نەمدەزانی کەسێک وا لە ئەویندا بتوێتەوە
چاوەڕێ بێو.. کەچی لە بری ئەو عیشقە هیچ نەدووزێتەوە

**

سـاڵان دێـن و ڕادەبـوورن.. لەوانەیـە چیـتر لـە چـاوانت نەڕوانم

دەترسـم چـاوانت بـبن بــە شووشــەی پەنجەرەیــەک کــە لەودیوییەوە هیچ نەبینم

لەوانەشە (چ ترسناکە کە دەیڵێم) من بمرم

ئەوسا جگە لە غەرق بوون لە تەم و مژ و هەورو باراندا..

هیچ نابینی.. هیچ نابینم

**

من خۆشتم دەوێ..!

***

تەنها ئەو سێ وشەیە بۆ من دیاری بوون

وەلێ کوشندەترین و پاکترین ئازاریشی بۆ من هانی

ئەمڕۆکـە گیاکـان بـە چرپـەوە ئـەم وشـانەیان بـە یـەکدی دەوتەوە

دڵنیابە کە هەورەکانیش دوێنێ هەمان ڕازیان وتۆتەوە

**

ئەوە بە تەنها من نیم کە بەو عیشقەوە گرفتارم
بەر لە من "پێترارک"یش لە پای ئەویندا گیرۆدە بوو
وەلێ من سوپاسگوزارم کە دەنێو بەفرو هەتاودا
ژیان بە دەست و دیارییەوە هات و.. لەگەڵما سپڵەو هیچ نەبوو

**

ئەو ژینە بوو کە پرشنگی ڕژاندە ناومێشکی کراوەم
گریشی هێنا بۆ دڵی شەیداو پەتیارەم
بابێ.. هەرچییەکی سالانی تازەی تەمەن دەیهێنێ
هەرچییەکی کەوتە دواوەو.. بەجێمان هێشتبێ

***

لەوێدا ژیا.. هەنووکەش دەژی.. هەتا هەتایە
ئەم سۆزو هەستە وا لە مرۆڤدایە
ئەو هەناسە پاکە.. پاک وەک تۆڵەیەکی مەزن و جوامێرانە
لە بەرامبەر سروشت.. کە ڕەنگە پاداشتی..
بۆ من و تۆ هەر مەرگ بێ

**

بەو ڕاڕەوە سپی‌یەدا من بە پەلە ڕادەبوورم
چاوی دەروازە گەورەکان لە دوامەوەو..
بە قێزەوە تێم دەڕوانن.. دەرم دەکەن
ڕێی دوورم لە بەردەمدایە.. تەخت و کراوە
تا دەگەمە ئەو پێچە..
هەر ئاواهی‌یە.. لەوە دەچێ.. تا کۆتایی

**

پەراوێز: لاریسا ژنە شاعیرێکی ڕووسی‌یەو لە (خارکۆڤ) و لە ساڵی (١٩٣٥)دا لە دایک بووە، لە ساڵی (١٩٥٨)دا بەشی فەلسەفەی لە زانکۆی "مۆسکۆ"دا تەواو کردووە. لە ساڵی (١٩٥٧)ەوە بەرهەمەکانی بڵاوکردۆتەوەو هەر لە مۆسکۆ-دا دەژی.

سەرچاوە:

The Tender Muse
Collection of Verse Moscow
First Print- 1976-

**هیند**

## "ئەوە باڵەخانەیە"

ئەختەر ئول ئیمان

ئەمن هیواکانم..
بە بەردو خشت و پۆڵا دەبەستمەوە
هەر وەک بڵێی خۆم گیراوەی خشت و بەردو پۆڵابم
لەوێ لەبەر ئەو پەنجەرەیە ڕادەوەستم
بەڵکو ئەوە خوایە.. شەوێ لە شەوان
گەر هات و لە خەو ڕا بوو
جارێ لە جاران بمبینێ
ئەو وەفایە من دەکوژێ..
هەر هەناسەیەکی هەڵیدەکێشم ئەوەم پێ دەڵێ.
لە سەعاتە مردووەکانی نیوە شەودا
هەر تەنها دووان وەئاگان

یەکێکیان منم.. ئەوی دیکەش دووکەڵکێشی ئەم ئاشەیە..

کە موڵکی پیاوێکی زەنگینە

هەر ساتێک کە ڕادەبرێ.. لە عومری شەو کەم دەبێ

هەر هەناسەیەک و ژیانیش کورتی دێنێ

ئەو هێزەش شک نابەم کە هەردوو لێوانم بدوورمەوە

هەر دەڵێی برینێکە لە لەشما

ناشتوانم ئەو خەمە بخۆمەوە چون ژەهری..

کوشندە بێ لە دەمما

ئیتر ناشتوانم بژیم..

ئەو وەختەی لەو بە دوور دەبم.

***

## "ڕۆژان"

<u>جۆزیف میزان</u>

ڕۆژانی تەمەن بوون بە گوڵ قاوە
عومری منداڵیش.. نە تام.. نە مانای لەلام نەماوە

*

ئەو ڕقەی لە دڵ کە دەیخۆیتەوە
هەرگیزاو هەرگیز.. قەت ناتویتەوە

*

مەینەتی.. من ڕۆڵەی دەردو مەینەتیم
ئاخ کە سێبەریشم فێڵی لێکردم

*

دەتلێمەوەو. چ قەهر و خەمێک دەچێژم
تەنها منم.. دەنێو توخمی ئینسان.. کاڵفام و گێژم

*

وەی کە حەزم دەکرد: مۆسیقا بوویتایە
هەر لە دوورەوە.. بە خرۆشانت..
دڵە تینووەکان بلەرزینایە

*

ڕۆژێ دێ.. لە خامێکی سپیدا قووماتم کەی
هەڵمبگریت و.. ڕووەو دونیایەکی دیکە بمبەی

*

هەنووکە بوومەتە گەردێ لە خۆڵ
لە ڕۆخانەی دەریای پڕ شەپۆڵ
هەر سات و لە کەنارێکم.. منی کڵۆڵ

*

ڕۆژێک دێ و.. بە دەست تۆوە من شێت بم
منێک کە ئازاری کوشندەی ئەوشۆ دەبینم

*

تۆ بووی کە ڕووی خۆتت لە من وەرگێڕا
من بووم دەستی تۆم گرت و بەرم نەدا

**ئای  لەو ڕۆژە خۆشانەی کە بەسەرمان برد..**

**بێ پەروا..!**

**سەرچاوە:  دیوانی شیعری ئەفریقی هاوچەرخ لاپەڕە (٩٠)**

## "ستەم"

**هیچ ئاسەوارێکی ئاخ و هەناسەم جێ نەما**

**قیژەی ئازارەکانم.. هەتا قریوەکانی تۆش..**

**هەر هەمووی هیچ**

**خرینگەی بازن.. پیاسەی شیرین.. گشت ڕووداوەکان**

**هەموو ئەو کارەساتانەش کە ڕۆحی خوێناوی ئێمەیان..**

**هەلاهەلا کرد**

**سەرپاکی سووتاند..!**

**کێ ماوە داوای دادێ بکا؟**

**کەسێک نەماوە بەخشندە**

**ناوی پەروەردگاریش دەنێو بۆشایی ئاسمانان**

**دەنگ دەداتەوە**

**دەنگ دانەوەو هیچی تر..!**

**له کتێبی:** شیعری هیندی هاوچەرخ. لاپەڕە (٣٣-٣٤)

## سێ پارچە شیعری ئەفریقی

## لە وڵاتی نایجیریاوە

(١)

### کلووە بەفرەکان.. نەرم دەبارێن

گابریل ئۆکارا

کلووە بەفرەکان..
هێدی هێدی دەبارێن
نەرم نەرم..
لە چاوی پڕ تەمی ئاسمانەوە..
دادەچۆڕێن..
بەسەر ئەو درەختانەی.
ماندووی ژێر زەبری زستانن..
دادەبارن
بەسەر ئەو لقانەی..
دەستی زستان ڕووتی کردوونەتەوە..

بە سەنگی بەفرێکی بێ سەنگ..

لەسەرخۆ شۆڕ بوونەتەوە!

وەک کەسانێکی پرسەدار..

کە خەم دڵی خواردوون.. چەماونەتەوە

ئەم بەفرەش..

دەبێ بە کفنی سپی و..

لەسەرخۆ.. ئەم زەوییە نەمرو زیندووە دادەپۆشێ

خەوی گرانیش بە دزییەوە هات

ئا لەنێو ئەو ئاگردانە هەستایەوەو..

پێڵووی چاوانی گران کردم

بە دەستێکی ئاوریشمین..

ئاوریشمی سەر ئاوکەوتوو..

بەری چاوانی گرتم!

**

خەوێکی گرانم لێ کەوت..

لەو خەوەدا خەونم دی..

بەڵام خەونم بە زەوییەکی مردووەوە نەدی

خەونم بە سنۆبەرەکانیشەوە نەدی
ئەو درەختانەی هەمیشە سەوزو.. وەئاگان
خەونم دی..
پۆل پۆل مەلی ڕەش لە ناخمەوە هەڵدەفڕین
لەسەر دارخورماکان هێلانەیان خۆش دەکردو..
هێلکەیان هەڵدێنان..
چەندەها خۆریشیان دەبرد بۆ میوەی..
سەر درەختەکان
لە خەوما دەمدی..
خاکەنازی ئەو پیاوانەی..
لە ڕەگەوە درەختەکانیان هەڵدەتەکاند
یەکە یەکە کون دەبوون و دەشکان
لە خەونما ئەو داربڕانەم دی..
شەل و شەکەت و گێڕو ماندوو بوون
پشتیان دادابووە سەر قەدو ڕەگی درەختەکانم
ئەو ڕەگانەش کە لە خۆیان بەجێ مابوون!
هەر دارخورمایەکیش..

هەر یەکەو خۆرێکی پێ بەخشین!

**

بەڵام لەسەر لەپیانا..

گلێنەی چاوی نابینایان ڕادەگرت و.. دەیان کێشا

نێوچەوانیان گرژ دەکرد

نێوچەوانی پڕ چاڵ و چۆڵ و قڵیش-

مڕومۆن بوون

چونکە تیشکی هەموو خۆرو ئەستێرەکان..

نە دەگەیشتن بە تروسکەی ئاڵتوون!

**

پاشان وەئاگا هاتم.. وەئاگا هاتم و..

بەفرم دی.. هێدی و هێمن دەباری

درەختەکانیش چەمابوونەوە

بە بای ساردی زستان دەلەرینەوە

هەروەک کۆمەڵێ موسڵمانی سپی پۆش

کە دوای نوێژی شێوان..

بە هەموو لایەکدا سەلام دەکەن

دیم..

زەویش، پڕ لە نهێنی، ڕاکشاوە

هەر دەڵێی ڕووی خوداوەندێکە..

لە مەزاری پیرۆزی کەڵێسایەکە..!

***

## شیعری دووەم

**(٢)**

### شەوێك لەسەر كەناری

### ڤیكتۆریا

لە دەریاوە.. بەگوڕ "با" دێ
شەپۆڵەكانیش.. هەروەک کۆمەڵێ ماری بە پێچ و لوول
هەروا دێن و دەخشن
لم و خۆڵی سەر کەنار دەکوتن
دەگەڕێنەوە.. بە تورەیی دەفیشکێنن!
پێو پلی "ئالادۆری"[1] یەکان دەشۆن
کە لەسەر لمی کەنار زۆرن و چەقیون
چاویشیان لە ئاسمان بڕیوە..
ڕووەو ئەو "شتە"ی کە بە تەنها دڵ دەیبینێ
بە دەم نوێژەوە هاوار دەکەن..

نوێژی "ئالادۆری"یەکان-

کۆشک و دوکانەکانیان جێ دێڵن..

بە زۆر وا لە خواپێداوەکان دەکەن..

گوێ بۆ ئەو بانگ و سەلأیە شل بکەن

لایتی ئوتمبێلەکانیش..

جووت جووت دڵداران لە ژوان دەکاو..

ڕایان دەپەڕێنێ

ئەوانیش دوو دوو.. قۆڵ لە قۆڵ دێن و دەچن

قەت لە چرپەو ڕازو سکاڵا، ناکەون

هەروەک بڵێی مامەڵە بێو..

ئەوانیش کڕیار و فرۆشیار بن-

کەچی "ئالادۆری"یەکان واز لە نوێژ ناهێنن

-نوێژی ئالادۆرییەکان-

هەموو.. دەستیان خستۆتە سەر دڵ و سینەیان

کراسە سپییەکانیشیان..

-بەهێزی با-

بە لەشیانەوە نووساون

خەڵکیش بیرەو شەرابی خورما دەخۆنەوە..
لووت بەرزانە.. بەوەوە خۆیان بادەدەن
کە لەسەر کەنار دەریا..
لە بارەکاندا پێک هەڵدەدەن..
کەچی ئەوان هەر نوێژ دەکەن
بۆ ئەو "شتە"ی کە تەنها دڵ دەیبینێ
ئالادۆرییەکان نوێژ دەکەن
کەچی ئێسقانی ماسیگرە مردووەکان
ئەوانەی چەندین ساڵە خنکاون
دادەڕزێن و ماسییەکان دەیانخۆن
ئەوانەی لە پێناو چوار سەدەفی زەرد..
کە وەک ئەستێرە دەتروسکانەوە
چوونە ژێر دەریای زۆر قووڵ..
لەوێ
لەو شوێنەی ماسییەکان -هەروەک کۆنگرەی دادگا-
کۆببوونەوە.. هەر لەوێ ماسیگرەکان خنکان
ماسیگرە زیندووەکانیش..

به چوار دەوری ئاگری کزدا..

لە نێو کوختە تاریکەکانا لێی دانیشتوون

"بابالاو"یش لەسەر لمی کەنار دەریا

ڕۆحیان دەخاتە ناو چوار سەدەف..

تا بزانێ بەیانی چی ڕوودەدا

کەچی ئەوان هێشتا هەر نوێژ دەکەن

"ئالادۆری"یەکان لە نوێژی خۆیان ناکەون

نوێژ بۆ ئەو زاتەی..

کە تەنها دڵ دەیبینێ!

لەودیو پێچ و لوولی شەپۆلەکانا..

لەودیو دەریای سەرشێت و پڕ گێژەنە..

لە پشت ئەو هەموو ئەستێرانەوە..

لە پشت یەکگرتن و یەکێتی هەموو ئاسمان..

کە تەنها ئەوان دەیبینن!

کەچی ئێسقانە سپییەکانیشیان

کەوتۆتە ژێر لمی کەنار دەریاکان..!

منیش لێرە.. مردووم و

لەسەر لمی مردوودا وەستاوم

خۆم دەبینم.. کەوتوومەتە سەرچۆک

هەردوو ئەژنۆکانیشم..

لەو خۆڵە زیندووە چەقیون

بەڵام بای توندوتیژ..

ئەو وشانەی هەڵوەراند..

کە لەسەر لێوما خونچەیان دەکرد.

**

(١)ئالادۆرییەکان: کۆمەڵێکن لە عیسا پەرستەکان باوەڕێکی ئاینیی پاڵیان پێوە دەنێ لە ئاودا. خۆیان پاك بکەنەوەو مەلەی تیا بکەن.

## شیعری سێیەم

### تەپڵێکی سیحراوی

لە ناخما.. دەنگی تەپڵێکی سیحراوی دێ
ماسی نێو ڕووبارەکانیش
لەگەڵیا کەوتوونەتە سەما
دەنگی تەپڵێکی سیحراوی دێ
لەگەڵ ئیقاعی ئەو تەپڵە
ژن و پیاوانیش کەوتوونەتە هەڵپەڕکێ
*
بەڵام لە پشت ئەو درەختەوە..
ئەو شۆخە خۆی مات داوە
بە کەمەرەی گەڵاو گوڵ
نێو قەدی خۆی شەتەک داوە

ئەوەتا سەر دەلەقێنێ..
بە ڕووما پێ دەکەنێ
من هەروا تەپڵ دەکوتم
لەگەڵ ئەو ئاوازە خێراو بەرزە
بگرە هەواش کەوتۆتە سەر سەماو لەرزە
ئەم ئاوازە
نەک هەر زیندوو..
بگرە مردووش دەخاتە سەر گۆرانی و سەما!
بەڵام لەودیو ئەم درەختەوە..
شۆخی کەمەرە گوڵ گوڵین
سەرم بۆ بادەداو..
نەرم زەردە دەیگرێ
*
لەگەڵ ئیقاعی هەموو ئاوازێکی سەر زەوی..
دەست لە تەپڵەکەم بەرنادەم
ئەو ئاوازەم لە چاوی ئاسمان دەپاڕێتەوە..
لە خوداوەندی خۆرو مانگ و ڕووبارەکان

هانا دەباتە بەر هەموو درەختەکان

ڕۆحیان بێتە بەرو..

بکەونە سەر سەماو سوڕدان..!

*

هەموو ماسی‌یەکان بوون بە مرۆڤ

هەموو مرۆڤەکانیش بوونە ماسی

هەموو شتەکانیش لە شوێنی خۆیان سڕبوون

چیتر نە نەشونومایان دەکرد

نە گەورە دەبوون

کەچی لە پشت ئەم درەختەوە

شۆخی کەمەرە گوڵ گوڵین

سەرم بۆ بادەداو.. زەردە دەیگرێ.

*

پاشان تەپڵی سیحراوی لە ناخما..

لە لێدان کەوت و دەنگی نەما

مرۆڤەکان وەک خۆیان لێهاتەوە

ماسی‌یەکان بوونەوە ماسی

درەختەکانیش.. خۆرو مانگیش..
هەریەکەو گەڕایەوە شوێنی خۆی
مردووەکانیش گەڕانەوە گۆڕەکانیان..
هەموو شتێکیش وەکو جاران
کەوتەوە نەش و نوما..
گەورە دەبوو..!

*

کەچی شۆخەکەی من..
لە پشت ئەو درەختە وەستا
لە هەردوو قاچی‌یەوە ڕەگ و ڕیشاڵ ڕوا
سەرو پرچیشی بوو بە گەڵاو گوڵ
لە لووتی‌یەوە دووکەڵێک دەرهات
لێوەکانیشی بە زەردەخەنە کرانەوە
دەمیشی بوو بە چاڵی تاریکی
لەوساتەوە تەپڵە سیحراوی‌یەکەم شاردەوە
سەری خۆم هەڵگرت و..
هەرگیز نەمهێشت دەنگی لێ بەرز بێتەوە!

**

## کورتەی ژیانی:

گابریل ئۆکارا: لە سالّی (١٩٢١)داو لە ناوچەی "ئیچۆ" و لە دەلتای – نیگەر-ی ولاّتی (نایجیریا) لە دایك بووە. لە کۆلیجی میری و لە -ئوموآهیا- دەرچووە.. پاشان بۆ ماوەیەك خەریکی بەرگ تێگرتنی کتێبان بووە. هەر لەو ساتەدا کەوتە شانۆگەری نووسینو باس و خواس ناردن بۆ ئیزگە. هەتا سالّی (١٩٦٧) لە "ئینوگو" بوو بە ئەفسەرو هەوالّ نێری کاروباری ناوخۆیی میری ڕۆژهەلاّت. هەندێ لە شیعرەکانی لە -بلاك ئۆرفیوس-دا بلاّوبوونەوە. بۆ یەکەمجار لە سالّی (١٩٥٧)دا کەوتە شیعر بلاّوکردنەوە. لە سالّی (١٩٦٤)دا ڕۆمانێکی لەژێر ناوی (دەنگ)داو لە لایەن -ئەندرێ دیوچ- بلاّوکرایەوە. ئۆکارا شاعیرێکی ڕۆشنبیرو لەخۆ ڕازی و بیر قووڵە.

سەرچاوەی ئەم شیعرانە

Modern Poetry from Africa Edited by Gerala Moore and Ulli Beier Penguin Books

ساڵەکانی چاپکردنەوەی (١٩٦٣-١٩٦٥-١٩٦٦-١٩٦٨-١٩٧٠-١٩٧٣-١٩٧٤-١٩٧٥)

لە بریتانیا لە چاپ دراوە

لاپەڕە (١٢٠-تا -١٢٦)

## ناوەڕۆك: